**یەكەم ژمارەی ڕۆڤار ٥-٥-١٩٩٩ دەرچوە**

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
ئیدریس عەلی

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تیراژ: ١٢٠٠

نرخ: ٢٠٠٠

ناونیشان
سلێمانی- شارێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەڕۆڤارەوە لەڕێگەی
ئیمێڵی
edrisali16@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

**ئیبراهیم ئەحمەد، محەممەد مەولود (مـەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارە ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هـەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەممەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەممەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەممەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەممەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحموی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەممەد ئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا، مەولەوی،قانیع.عوسمان چێوار.کەریم کابان،ڕەفیق حیلمی، مستەفا زەڵمی.ئازاد شەوقی. شێخ نوری شێخ سالح.**

سەرۆکی فەخری

شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا

ئازاد بەرزنجی

**بەڕێز فاروق مەلامستەفا سپۆنسەری ئەم ژمارەییەی کردووە**

ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار تەرخان کراوە بۆ گەورە بیریاری ئیسلامی و نوێگەر و زانای لێهاتوو ( سەعید نوورسی) ناسراو بە ( بەدیعوززەمان) بە پێویستمان زانی ئاوڕێکی درەنگوەخت لەم کەڵە پیاوەی کورد بدەینەوە کە خاوەنی دیدگا و دونیابینیی تایبەت بە خۆیەتی بۆ دین و خوداپەرستی و لەم پێناوەشدا هزر و تێڕامانە قووڵ و فراوانەکەی خۆی خستووەتە کار و چەندین کتێبی گرنگی داناوە کە بە شێوەیەکی زانستی لە چەمکە ئایینییەکان ڕاماوە و گوزارشتی لە بیروباوەڕی تایبەتی خۆی کردووە بۆ مرۆڤ و گەردوون و ئایین و دیاردەکان. (پەیامەکانی نوور) دیارترین بەرهەمە چاپکراوەکانی بەدیعوززەمانە کە سەد و سی زنجیرەن و لە ماوەی بیستوپێنج ساڵدا(١٩٢٩-١٩٥٠ز) نووسیونی و بڵاوی کردوونەتەوە. وەک زۆرێک لە سەرچاوە و بەڵگەنامەکان جەخت دەکەنەوە، ژیانی مامۆستا سەعید نوورسی، وەک ژیانی فەیلەسووفەکانی پێشوو وابووە، زۆر بە دژواری ژیاوە و هەرگیز چاوی لە شتە دونیاییەکان نەبووە و هەموو هەوڵ و تێکۆشانێکی خۆی بۆ باوەڕەکانی تەخان کردووە و هەر لە تەمەنی گەنجێتییەوە دەستبەرداری خۆشییەکانی ژیانی تایبەتی خۆی بووە و ڕێگەی پڕ لە نشێو و دڕکوداڵی نووسین و بیروباوەڕەکانی خۆی گرتووەتە بەر.

بۆ ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار پشتمان بە کۆمەڵێک نووسەر و لێکۆڵیاری بەتوانای کورد بەستووە کە بە نووسین و بابەتەکانیان هاوکارمان بوون لە دەوڵەمەند کردنی ڕۆڤار و زیاتر ناساندنی سەعید نوورسی بە خوێنەری کورد، جێی خۆیەتی لێرەدا و بۆ ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار، سوپاسگوزاری مامۆستا ( فارووق ڕەسووڵ یەحیا) بین کە دڵسۆزانە هاوکاریی کردین و ڕێنیشاندەرمان بوو لە چۆنییەتیی بەدەستهێنانی زانیاری لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی بەدیعوززەمان.

**بەڕێوبەری نووسین**

# پوختەیەک لە ژیانی بەدیعوززەمان مامۆستا سەعیدی نوورسی لە چەند خاڵێکدا

* ناوی «بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی»یە.
* لە نێوان چیا بڵندەکان و لە گوندی «نوورس»ی سەر بە پارێزگای «بەدلیس»ی کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی (باکووری کوردستان) لە بنەماڵەیەکی کوردی دیندار لەدایک بووە.
* لە نێوان ساڵەکانی (١٨٧٦-١٩٦٠ز)دا ژیاوە.
* «صۆفی میرزا»ی باوکی بە خواپەرستی و پیاوچاکی بەناوبانگ بووە و هەر خۆراکێک حەڵاڵ نەبووبێت، دەرخواردی منداڵەکانی نەداوە. خاتوو «نووریە»ی دایکیشی بە پاکوخاوێنی و دەستنوێژەوە نەبووبێت شیری بە منداڵەکانی نەداوە!
* دایکی لە کاتی جەنگی جیهانیی یەکەم و باوکیشی لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا کۆچی دواییان کردووە و لە گۆڕستانی گوندی «نوورس» نێژراون.
* چوارەم منداڵی خانەوادەکەیانە کە یەک لە دوای یەک ئەمانەن:
(دوڕڕییە، خانم، عەبدوڵڵا، سەعید، محەممەد، عەبدولمەجید، مەرجان) کە هەموویان خوێندەوار بوون، تەنانەت هەندێ لە خوشکەکانیشی لە ڕیزی زانایاندا ناو براون. ئەوەش بۆ ئەو قۆناغەی کۆمەڵگەی کوردەواری بە هەنگاوێکی پێشکەوتوو دانراوە.
* لە پێشدا لە لای «مەلا عەبدوڵڵا»ی براگەورەی دەستی بە سەرەتاکانی خوێندن کردووە، پاشان چەندین گوند و شاری کوردستان گەڕاوە و لای زانا گەورەکانی ئەو سەردەمە وانە گرنگەکانی خوێندووە.
* کەسێکی هێندە زیرەک بووە کە بە ماوەیەکی کەمی خوێندن و لە تەمەنی چواردە ساڵیدا «بڕوانامەی زانایی» لە زانستە ئیسلامییەکاندا بە دەست هێناوە.

* بە هەوڵ و تەقەلای خۆی شارەزایی لە زانستەکانی ڕۆژگاردا، وەک: کیمیا، فیزیا، بایۆلۆجی، جیۆلۆجی، بیرکاری، گەردووناسی، جوگرافیا و... پەیدا کردووە.
* لەبەر زیرەکیی ناوازە و لەڕادەبەدەری، لە لایەن زانایانەوە نازناوی (سەعیدی مەشهوور) پاشان (بەدیعوززەمان)ی پێ دراوە.
* بە گەورەیی فێری زمانی (تورکیی عوسمانی) بووە و گەورەئەدیبی هاوچەرخی شاری سلێمانی (پیرەمێرد) لەو ڕووەوە یارمەتیی داوە کە ئەو دەمە لە ئەستەنبووڵ هاوڕێی گیانیبەگیانی بوون و لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیتیحادییەکاندا ماوەیەکیش پێکەوە بەند کراون.
* یەکەم وتاری کوردیی ڕۆژنامەی (تەعاون و تەرەقیی کورد) لە نووسینی مامۆستا سەعیدی نوورسییە بە ناوی (ئەی گەلی کوردان) کە لە کتێبی (داوەرییەکان)دا لە بەرگی شەشەمی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)دا بڵاو کراوەتەوە.
* یەکەم کەسە هەوڵی داوە بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا و کردنەوەی قوتابخانەی کوردی و خوێندنی وانەی زانستەکانی سەردەم شانبەشانی زانستە ئایینییەکان.
* چەندین پڕۆژەی چاکسازیی بۆ بەرەوپێشبردنی باری زانستی و کۆمەڵایەتی و کارگێڕیی کوردستان خستووەتە بەردەم بەرپرسانی دەوڵەتی عوسمانی، بەڵام مخابن، لەبری ڕێزلێنان و نرخزانینی خەمخۆری و تەقەلاکانی، ڕووبەڕووی دادگاییکردن و بەندکردن کراوەتەوە.
* گەورەترین کەسایەتیی فەرهەنگیی کوردی ئەم سەردەمەیە کە لە دوای مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە ناو نەتەوەی کورددا هاتووەتە دنیاوە و ناوبانگی جیهانیی بۆ دروست بووە و لە ڕووبەرێکی فراوانی سەر زەویدا سوود لە بەرهەمەکانی وەردەگیرێت و توێژینەوەی زانستییان لەسەر دەکرێت.
* تاکە کەسایەتی بووە کە هەموو زەبروزەنگێکی مستەفا کەمال و دامودەزگا چەوسێنەرەکانی و سیوپێنج ساڵی بەندی و زیندانی تاکەکەسی و دوورخستنەوە و دەستبەسەری و دەیان دادگای تۆقێنەر نەیانتوانیوە کۆڵی پێ بدەن و لە خەباتی ڕەوای خۆی بیترازێنن.

* زیاتر لە سەدوسی کتێب و نامیلکەی لەژێر ناونیشانی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)دا نووسیوە و بڵاوی کردوونەتەوە.
* وەرگێڕانی سەرجەمی پەیامەکانی نوور بۆ (زمانی عەرەبی) لە لایەن مامۆستا (ئیحسان قاسم صاڵحی) یەوە تەواو بووە و لە دە دانە بەرگی قەشەنگدا و تا ئێستا لە چەندین وڵاتی وەک تورکیا و میسر و هیندستان چەند چاپێکی یەک لە دوای یەکیان لێ بڵاو کراوەتەوە.
* بەشێکی زۆریشیان لە لایەن ئافرەتی نۆموسوڵمان: ماری وێڵد (شوکران واحیدە)ەوە کراون بە (زمانی ئینگلیزی) و تا ئێستا حەوت بەرگی گەورەیان بەو زمانە لێ بڵاو کراوەتەوە.
*بە (زمانی کوردی)یش هەتا ئێستا هەشت بەرگی گەورەی بە (بە زاری سۆرانی) لێ چاپ کراوە، کە ئەم بەرگانەن: (وتەکان، مەکتووبات، بریسکەکان، تیشکەکان، پاشبەندەکان، داوەرییەکان، ئاماژەکانی ئیعجاز، ژیاننامەی سەعیدی نوورسی) کە هەموویان لە باشوور و خۆرهەڵاتی کوردستان بڵاو کراونەتەوە، جگە لە سیوپێنج کتێب و نامیلکەی سەربەخۆ.
* (بە زاری کرمانجی)یش دوو بەرگ و چەندین نامیلکەی ئەم پەیامانە، بەشی زۆریان لە باکووری کوردستان و هەندێکی کەمیان لە باشووری کوردستان، لێ بڵاو کراوەتەوە.
* چەند بەشێکی (کەم تا زۆری) ئەم پەیامانە بۆ ئەم زمانانەی خوارەوەش وەرگێڕدراون، کە تا ئێستا کاری وەرگێڕان تیایاندا بەردەوامە:
(ئەڵمانی، ئەلبانی، ئیتاڵی، ئیسپانی، ئازەری، ئۆزبەکی، ئوردوو، ئیندۆنیسی، بەنگالی، بولگاری، بۆسنی، پرتوگالی، پشتۆ، تاجیکی، تەتاری، تالشی، تورکمانی، جۆرجی، چینی، دانیمارکی، ڕۆمانی، ڕووسی، ژاپۆنی، سانسکریتی، سلۆڤاکی، سەواحیلی، سویدی، فەڕەنسی، فیلیپینی، فارسی، ڤێتنامی، قەرقیزی، کازاخی، کۆری، کرواتی، گۆجیراتی، لاتینی، مالی، مالیزی، مەقەدۆنی، نەیجیری، هۆسا، هیبرۆ، هیندی، هەنگاری، هۆڵەندی، یۆنانی.)
* تا ئێستا لە لایەن قوتابیانی «نوورسی»یەوە سێ کۆنفراسی زانستی بۆ (وەرگێڕەکانی ئەم پەیامانە بۆ زمانە جیاجیاکان) ساز کراوە کە تیایدا بە

پەیامەکانی نوور و ڕێبازی وەرگێڕانیان ئاشنا دەکرێن و خۆیشیان سوود و ئەزموونی کار لەگەڵ یەکتر دەگۆڕنەوە.
* هەروەها تا ئێستا حەوت کۆڕبەندی زانستییان بۆ توێژەرانی ئەکادیمی لەمەڕ پەیامەکانی نوور ساز کردووە کە تیایدا بە پەیامەکانی نوور و ڕێبازەکانی توێژینەوە شارەزا دەکرێن و ڕێنمایی پێویستیان پێشکەش دەکرێت.
* ئەو توێژینەوە ئەکادیمییانەی کە وەک نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرا لەسەر نوورسی و بەرهەمەکانی لە زانکۆ جیاجیاکانی جیهاندا تا ئێستا بڕوانامەیان پێ وەرگیراوە، گەیشتوونەتە دووسەد توێژینەوە و هەندێکیان لە کوردستان و لە لایەن توێژەری کوردەوە بوون.
* تا ئێستا زیاتر لە شەست کۆنگرەی جیهانی (کە هەندێکیان لە باکووری کوردستان و شارەکانی دیکەی وڵاتی تورکیا بووە) و دەیان کۆڕی زانستی و پێشبڕکێی ڕۆشنبیری لە ئاستی جیهاندا لەسەر بەرهەمەکانی مامۆستا نوورسی کراوە و دەیان کتێب و سەدان لێکۆڵینەوەی لەسەر نووسراوە، هەندێک لەوانە لە کوردستاندا بووە.
* دواهەمین گەورە کۆنگرەی جیهانیی شاری ئەستەنبوڵ لەسەر مامۆستا بەدیعوززەمان لە ڕێکەوتی (٢٢-٢٠١٣/٩/٢٤ز)دا ساز کرا و نزیکی سێسەد کەسایەتیی زانستی لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانی جیهانەوە تیایدا بەشدار بوون و نەوەدوشەش توێژینەوەی زانستیی تێدا تاوتوێ کرا. چەندین توێژەری باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش بەشدارییان تێدا کرد.
* لە باشووری کوردستانیشدا، هەتا ئێستا سێ سیمینار تایبەت کراوە بە مامۆستا نوورسی و پەیامەکانی، لە شارەکانی (هەولێر، سلێمانی، سۆران).
* لە ڕێکەوتی ٢٠١٦/٣/٢٦دا (ئەمینداریێتیی گشتیی ئەنجومەنی زانایانی عێراق) بە هاوبەشی لەگەڵ سەنتەری ڕۆشنبیریی (وقف الخيرات) نەدوەیەکیان لە شاری هەولێر ساز کرد کە بابەتەکان بە زمانی عەرەبی پێشکەش کران. لە باشووری کوردستانیش (فارووق ڕەسووڵ یەحیا) وەرگێڕی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور) بۆ زمانی کوردی، وتەیەکی بە زمانی عەرەبی تێدا پێشکەش کرد.

# «زەهرا»، یەکەم زانکۆی کوردی

**حەسەن حەمەکەریم**

زانای بەناوبانگی کورد و جیهانی ئیسلام بەدیعوززەمان سەعید نوورسی (١٨٧٦-١٩٦٠) لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا کە هەڕەتی ڕووداوە خێرا و گۆڕانکارییە گەورەکانی مرۆڤایەتی بوو، چەندین هەوڵی دا بۆ گەڵاڵەکردنی هەندێ پرۆژە بە مەبەستی پێشخستنی باری زانست لە ناوچە کوردنشینەکاندا.
مامۆستا بە چاوی خۆی دواکەوتوویی کوردانی دەبینی و لەگەڵ ژیانی ئەستەنبووڵدا بەراوردی دەکرد، هەردەم لە خۆیی دەپرسی: بۆ ئەوان پێشکەوتوون و ئێمەیش دواکەوتووین؟ بە خۆی دەڵێ: «ئاگر لە هەناوم بەردەبوو بۆ دواکەوتنی ئەم نەتەوەیە و هاوارم دەکرد: ئاخ... ئاخ... بە داخەوە کە خەڵەتاین و کاکڵە و گەوهەری ئیسلاممان پشتگوێ خست و ڕوانینی خۆمان ترنجاندە ڕواڵەت و توێکڵەکەی.»١ هەر بەم هەستەیشەوە بوو بەشدارییەکی کارا و بەرچاوی کرد لە گەشەکردن و بەرەوپێشبردنی ڕێکخراوی (جەمعیەتی تەعالی کوردستانی)٢ کە یەکەم ڕێکخراوی کوردییە بە ڕەزامەندیی دەوڵەت دامەزرا بە مەبەستی پێشخستنی زانست و ڕۆشنبیریی کوردستان. سەعیدی نوورسی یەکێکیش بووە لە نووسەرە بەبڕشتەکانی٣ ڕۆژنامەی (کورد) کە زمانحاڵی ئەو ڕێکخراوە بووە و چەندین ڕاپۆرت و وتاری بڵێسەئامێزی بە زمانی کوردی لەو ڕۆژنامە و ڕۆژنامەی (شەرق و کوردستان) و (ولقان)دا بۆ وریاکردنەوەی ڕۆڵەکانی میللەتەکەی و پێشخستنیان بڵاو کردووەتەوە، هەروەها یەکێک بووە لە دەستەی دامەزرێنەرانی (جەمعییەتی نەشری مەعاریفی کوردستانی).٤
سەعیدی نوورسی شێوازێکی تریشی گرتە بەر کە پێشتر و دواتریش نەکراوە، ئەوە بوو خۆی بە کردەیی بە ناو شار و گوندەکاندا گەڕا و هەوڵی دەدا ئاشنایان بکات بە قوتابخانە نوێیەکان.

یەکێک لەو پرۆژە هەرە گرنگانەی کە بەدیعوززەمان لەو کاتەدا پێشکەشی کرد، بریتی بوو لە (پرۆژەی زانکۆی زەهرا). ئەو لە ژیانیدا زۆر بەئاوات بووە خزمەت بە فەرهەنگ و ئاستی زانستیی کوردان بکات و ئەم پرۆژەیەش بووە بە بەشێک لە ژیانی و وەک ئیلهامبەخش و تەوەری ڕێنما بووە بۆ سەرجەم هزر و کارەکانی داهاتووی. پوختەی بیروبۆچوونەکانی و ڕەوڕەوەی ژیانی بەگوێرەی قۆناغە جیاوازەکان لەسەر ئەم هیوا و ئاواتە ئاڕاستە کردووە. مرۆڤ گەر بە وردی مێژووی ژیان و دانراوەکانی مامۆستا بخوێنێتەوە، بۆی دەردەکەوێ کە یەکێک لە ئامانجە هەرە بەرزەکانی ژیانی، یان خۆی واتەنی، «ئاواتی ژیانی» ئەوە بووە کە ئەم زانکۆیە لە وڵاتەکەیدا بێتە ئاراوە و ڕۆڵی کاریگەریی خۆیی هەبێ.

## زنجیرەی هەوڵەکان بۆ ئەنجامدانی پرۆژەی زانکۆی زەهرا

دەتوانین بڵێین هەر لە سەرەتای لاوییەوە تا کاتی وەفاتی لە هەوڵدا بووە بۆ دامەزراندنی ئەو زانکۆیە و بە ئاواتی هەرە گەورەی خۆیی داناوە، تەنانەت بە قوتابییەکانی خۆیی دەگوت (قوتابیانی زانکۆی زەهرا)، بەڵام بەگوێرەی زنجیرەی هەوڵدانی مێژوویی بەم جۆرە باسی دەکەین: ساڵی ١٨٩٦ کە هێشتا لاوێکی نەونەمامە، بۆ ئەو مەبەستە دێتە ئەستەنبوڵ و هەوڵی دیتنی سوڵتان دەدات. ساڵانی ١٩٠٥-١٩٠٦ بە ناوچە و هۆزەکانی کورددا گەڕاوە و لەگەڵ بژاردە و خەڵکی ئاساییدا ئەم بابەتەی باس کردووە. لە شێوەی قەناعەتپێکردندا هەوڵی داوە دەربارەی سەردەمی نوێ خەڵک هۆشیار بکاتەوە. ساڵی ١٩٠٧ دەچێتە ئەستەنبوڵ و سوڵتان دەبینێت و لەگەڵ وەزیر و کاربەدەستاندا مشتومڕێکی زۆر دەکات، تەنانەت بە تۆمەتی شێتی دەخرێتە شێتخانەوە. لە ساڵی ١٩٠٨دا پاش هاتنی ئیتیحادییەکان بۆ سەر دەسەڵات، دیسان داواکەی بەرز دەکاتەوە و لە ڕۆژنامەکاندا زۆری لەسەر دەنووسێت و دەڵێ: من لەم کارەدا زمانحاڵی گەلی کوردم. ساڵی ١٩١١ پاش گەڕانەوەی لە سەفەری شام، دیسان دەچێتە بەر دەرگای دەسەڵاتداران و ئەم جارە سوڵتان ڕەشاد ڕەزامەندی دەردەبڕێت و بیستهەزار لیرەی ئاڵتوونی بۆ دەبڕێتەوە، ئیتر مامۆستا دەڕوات بۆ شاری وان و لەگەڵ خەڵکدا بەردی بناغە بۆ زانکۆکە دادەنرێت، بەڵام زۆر نابات هەڵگیرسانی جەنگی گێتیی یەکەم و تێوەگلاندنی دەوڵەتی عوسمانی لەو جەنگەدا ئەم پرۆژەیە لەبار دەبات و ناوچەی کوردستان دەبێتە مەیدانی جەنگی عوسمانی و ڕووسەکان و ئەرمەنەکان. دوای کۆتاییهاتنی جەنگیش، کەمالییەکان دەست بەسەر وڵاتدا دەگرن و ئەم بابەتە دیسان تەنها لە خەیاڵدا دەبێت تا ساڵی ١٩٥٠ کە بە دەرچوونی دیموکراتەکان لە هەڵبژاردن و کرانەوەیەکی جوزئی، دیسان مامۆستا نوورسی لە مەنفاوە نامەیەک بۆ سەرۆککۆمار دەنێرێ و داوای کردنەوەی زانکۆکەی دەکات، ئەوانیش ڕازی دەبن، بەڵام ڕەچاوی ئەو مەرجانە ناکرێت و بە ناوی زانکۆی خۆرهەڵاتەوە دەوڵەت

سەعیدی نوورسی

دەیخاتە لیستی کارە گرنگەکانی خۆیەوە. هەرچەندە بە مەرجەکانی مامۆستا نەبوو، بەڵام هەر پێی خۆش بوو، چونکە هەرچۆنێک بێت، سوودێکی بە ناوچەکە دەگەیاند.٥

**هۆکارەکانی داواکردنی دامەزراندنی زانکۆی زەهرا**

لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا لە خۆرئاوا شۆڕشێکی بەرفراوانی زانستی سەری هەڵدا. مامۆستا هەستی بەوە کرد کە لە داهاتوودا زانست ڕۆڵی باڵا دەبینێت و حوجرەکانیش دەکەونە بەر مەترسیی لەناوچوون. ئەوەیشی لە بەرچاو بوو کە بە درێژایی مێژوو حوجرە تاکە سەرچاوە و پارێزەری مێژوو و کەلەپووری گەلەکەی بووە، بۆیە دەستی دایە دانانی پرۆژەیەک بۆ تەباکردنی ئەم دوو خوێندنگەیە. خۆیشی گرنگترینی هۆکارەکان بەم شێوەیە باس دەکات:

١- دابەزینی ئاستی زانست لە حوجرەکاندا:

بەدیعوززەمان هۆیەکی گرنگی دابەزینی ئاستی زانستە ئایینییەکان و لادانیان لە ئاراستەی سروشتیی خۆیان دەگێڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارە و دەڵێت: «کاتێ کە زانستە «ئامرازەکان» خرانە ناوەندی زانستە مەبەستەکانەوە، هەر ئەو کاتە زانستە باشەکان پشتگوێ خران، چونکە شیکردنەوەی دەستەواژەی عەرەبی، کە پۆشاکەکەی (وشەکەی) لە حوکمی واتاکەیدایە، بەسەر زەینەکاندا زاڵ بوو، ئینجا ئەو زانستەش کە مەبەستی سەرەکییە لە خوێندندا، بوو بە پاشکۆی ئەو.»٦ چەندەها دایک و باوک بە دڵ و گیان منداڵەکانیان دەخستە بەر خوێندن، بەڵام ئەو منداڵانە کە دەبوون بە فەقێ، گیرۆدەی پرۆگرامی قورسی بابەتە وشکەکانی نەحو و سەرف و بەلاغە و مەنتیق دەبوون و زۆربەی توانا و تەمەنی خۆیان لەم ڕشتانەدا بەتاڵ دەکردەوە، زۆربەیان هەر زوو وازیان دەهێنا، هەندێکیان ماوەیەک دەڕۆشتن و دەبوون بە کۆلکەمەلا، کەمێکیان دەگەیشتنە زانستە بەرزەکان و دەبوون بە مەلا.

گەرموگوڕیی دەمەقاڵێی کۆڕی زانا و مەلاکان لەسەر بابەتە لاوەکی و هەندەکییەکان و خۆنوقمکردنیان لە بابەتە زمانەوانییەکان و مەنتیق و بەلاغەدا و هەوڵدان بۆ زاڵبوون بەسەر یەکتردا بە تەواوی باڵی بەسەر مێشکی خوێندەوارانی ئەو دەمەدا کێشابوو، بەدیعوززەمان -کە ئەمەی پێشەوەش هەر ڕای خۆیەتی- دەڵێت:

«کەسانێکی یەکجار زۆر بە مەیلی سەرکردایەتی و فەرماندەیی و خۆگەورەدانان بەسەر خەڵکانی تردا ڕەفتار دەکەن، دەبینی «زانست» کە شتێکی شەوقبەخش و ڕابەر و ئامۆژگار و نەرمونیانە، بە وێنەی هۆکارێکی زەبر و زۆرەملێیی «خۆسەپاندنی کەسی» بەسەر خەڵکانی تردا بەکار دەهێنرێت، واتە لەبری ئەوەی خزمەت بە زانست بکات، دەچێ لە خزمەتی خۆیدا دەیخاتە کار! بەم پێیە، کارمەندییەکان -نەخوازەڵڵا- قوتابخانە ئایینییەکان، کەوتنە دەست کەسانێکی نەشیاو. لە ئەنجامە ئەوەشدا قوتابخانەکان بەرەو پووکانەوە و نەمان ڕۆشتن.»٧

٢- چاکسازی لە ویلایەتەکانی کوردستاندا

لە یاداشتێکیدا بەدیعوززەمان دەڵێت: «من بارودۆخی پەرێشانی کوردەکانی دانیشتووی کوردستانم بینی و تێگەیشتم کە ڕوویەکی بەختەوەریی دنیامان بە زانستە نوێیەکانی ئێستا دێتە دی، زانایانیش یەکێک لە ڕوبارە سازگارەکانی ئەو زانستە دەبن و سەرچاوەکەی تریشی -بە دڵنیاییەوە- قوتابخانە ئایینییەکان دەبێت، تاکو زانایانی ئایینیی لەگەڵ زانستە تازەکان ڕابێن. لەبەر ئەوەی جڵەوی ئیختیاری کوردەکان بە دەست زانایانەوەیە، ئەوا ئەم هەستە هانی دام کە بێم بۆ ئەستەنبووڵ.»٨

هەروا لە ئەستەنبووڵ داواکارییەکی پێشکەش بە (سوڵتان عەبدولحەمید) کردووە سەبارەت بە کردنەوەی خوێندنگەی کوردی لە شار و گوندەکانی کوردستاندا، لەوانەش زانکۆی زەهرا، کە لە ڕۆژنامەی (شەرق و کوردستان)دا بڵاو کرایەوە: «خەڵکی کوردستان ڕەگەزێکی گرنگی قەوارەی کۆمەڵگەی عوسمانی پێک دەهێنن، هەرچەندە بارودۆخیان لای دەوڵەت ئاشکرایە، بەڵام داواکارم دەرفەتم بدەن هەندێ داواکارییان بۆ بخەمە ڕوو کە تایبەتن بە خزمەتی پیرۆزی «زانست»:

لەم دنیای شارستانیەتەمان و لەم چەرخی پێشکەوتن و پێشبڕکێیەدا بۆ مەبەستی بەرزبوونەوەی پلەی زانیاری، کوردەکان -وەک برایانی تر- پێویستیان بە کردنەوەی قوتابخانە هەیە لە ناوچەکەیاندا.

هەرچەندە کۆششی حکومەت جێی سوپاسە لە کردنەوەی چەندە قوتابخانەیەک لە مەڵبەندی قەزا و گوندەکاندا، بەڵام جگە لە منداڵە تورکزمانەکان کەسی تر سوودیان لێ وەرناگرێ، ئەو قوتابییانەش کە کوردزمانن، هەر ئەوەندە لە قوتابخانە تێدەگەن کە سەرچاوەی زانستە، یان دەزگایەکی زانستییە و هیچی تر سوودی لێ وەرناگرن. خۆ نەشارەزایی مامۆستایانی ئەو قوتابخانانە لە زمانی خەڵکی ناوچەکە کۆڵێکی تری قورسی خستووەتە ئەستۆی قوتابیان و لە ئەنجامدا بوو بە هۆی بێبەشبوونیان لە زانست. ئەم بارە نامۆیە کارێکی وای کردووە کە خۆراواییەکان بەو دواکەوتنەی کوردان خەنی و شاد بن.٩

بەدیعوززەمان ئەم نەخشەیە بە پیلانێکی ترسناک دادەنێت و مەترسیی ئەوەش دەخاتە بەر خەلیفە و دەوڵەت کە ئەگەر کار وا بڕوات، ئەوا غیرەتمەندان و ڕووناکبیران لەو نەخشەیە تووڕە ببن و بێزاری دەرببڕن و دەڵێن بۆ؟ ئەوەتا بە زمانی هەڕەشەئامێزەوە دەڵێ: «ئەمڕۆ بە چاوی خۆمان دەبینین ئەو نەتەوانەی کە لە هەموو ڕوویەکەوە پلەیان لە خوار پلەی کوردەوە بووە، وا ئێستا سوود لە باری دواکەوتووی کورد وەردەگرن و پێشیان دەکەون، ئەم دۆخەیش کارێکی کردووە کە غیرەتمەندانی کورد بکەونە بیرکردنەوە.»

نوورسی پێی وایە ئەم هۆکارە جەوهەرییانە مستەکۆڵەیەکی جەرگبڕیان ئاراستەی کورد کردووە و ئاگریان بەرداوەتە دڵ و هەناوی ئەو کەسانەی زانا و ئاگادار و چالاک و بیرتیژن.

بەدیعوززەمان لە بەرگی شەشی پەیامەکانی نووردا بە ناوی (داوەرییەکان) باس لەوە دەکات کە بۆ بابەتی زانکۆی زەهرا خۆی کردووەتە گەڕیدە و بە ناو هۆز و خێڵەکانی ناوچەی کوردستاندا گەڕاوە، ڕای زانایان و خەڵکی کوردی لەسەر ئەو بابەتە وەرگرتووە و هەموان بەبێ جیاوازی پێیان باش بووە و ڕایان لەسەری بووە. لەبەر ئەوە دەڵێ: من لەم کۆششەمدا وەک لەجیاتیی خەڵکی ئەو ناوچەیە و بە ناویانەوە بم، وایە و گوزارش لە ئاواتەکانی ئەوان دەکەم. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کوردان زۆر تامەزرۆی زانیاری و پێشکەوتن بوون.

٣- بەهێزکردنی برایەتی و پێکەوەژیانی گەلانی ناوچەکە

بەو پێیەی کوردستان لە ڕووی جوگرافییەوە کەوتووەتە نێوان چەند نەتەوەیەکی ترەوە، ئەوەتا بە نەتەوەکانی عەرەب و تورک و فارس دەوری دراوە، مامۆستا پێی وابووە دامەزراندنی زانکۆی زەهرا لە کوردستان و کردنی بە مەڵبەندی زانستی بۆ دەوروبەری، ڕۆڵێکی گەورە دەگێڕێ بۆ نەهێشتنی دەردی نەتەوەپەرستی، چونکە دەمارگیریی نەتەوەیی لە ژینگەی نەفامیدا گەشە دەکات، بەڵام ئەم خوێندنگەیە دەبێتە فاکتەرێکی گونجاو بۆ پێشکەوتنی ئەو گەلانە و کرانەوەی زیاتریان بە ڕووی یەکتردا، ئەوەتا خۆی دەڵێ: «مزگەوتی ئەزهەر قوتابخانەیەکی گشتییە لە کیشوەری ئەفریقادا، کەواتە کارێکی گەلێ پێویستە لە کیشوەری ئاسیاشدا قوتابخانەیەکی وەک ئەو بونیاد بنرێت، تەنانەت بە ڕێژەی فراوانی ئاسیا لەچاو ئەفریقادا، ئەم قوتابخانەیەش لەچاو ئەزهەردا فراوان بێت تاکو بیری «دەمارپەرستی» برایەتیی نێوان نەتەوەکانی وڵاتە عەرەبییەکان و هیندستان و ئێران و قەوقاز و تورکستان و کوردستان تێک نەدات و «گیانی ئیسلامەتی»یش کە نەتەوایەتی ڕاستەقینە و ڕاست و دروست و بەرز و هەمەلایەنەیە، لە نێوانیاندا ببوژێنرێتەوە و شەرەفمەندیی ئەم دەستوورە قورئانییە بن کە دەفەرمووێ: (إنما المؤمنون إخوه) (الحجرات:١٠).

٤- ئاشناکردنی شارستانییەتی خۆرئاوا بە ڕاستییەکانی قورئان

مامۆستا بەدیعوزەمان هەڵوێستی قبوڵکردنی بێقەیدوشەرت و ڕەتکردنەوەی بێقەیدوشەرتی شارستانییەتی خۆرئاوای ڕەت کردەوە. بە پرۆژەی زانکۆی زەهرایش ویستی گونجان و تەبایی نێوان شارستانییەتی خۆرئاوا و ڕاستییەکانی ئیسلام

سەعیدی نووری

بە کردەیی بسەلمێنێ، ئەوەتا دەفەرمووێ: «بۆ ئەوەش کە ئەو زانستانەی لە فەلسەفەوە سەریان هەڵداوە، لەگەڵ ئاییندا دەست لە ملی یەکتر بکەن و شارستانییەتی ئەورووپاش بە تەواوەتی لەگەڵ ڕاستییەکانی ئیسلامدا بسازێن و قوتابخانە تازەکانیش لەگەڵ قوتابخانە شەرعییەکانی ئەنادۆڵدا هاوکار بن و ڕێکبکەون، بۆیە هەموو هەوڵ و تواناکانی خۆمم بۆ دامەزراندنی ئەم زانکۆیە لە مەڵبەندی پارێزگاکانی کوردستاندا خستە گەڕ کە ناوەندێکە لە نێوان هیندستان و وڵاتە عەرەبییەکان و ئێران و قەوقاز و تورکستان و ناوی «قوتابخانەی زەهرا»م لێ نا، کە قوتابخانەیەکی نوێ و شەرعییە لە هەمان کاتدا.١٠

٥- سەقامگیرکردنی (ئاشتی) و بوارنەدان بە دەمارگیری

بەدیعوززەمان دەیەوێ بڵێ بەردی بناغەی سەقامگیری و ئاشتیی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بەستراوە بە بەرقەراربوونی ئاشتی لە ناوچەی کوردستان و کپکردنی بووقی دەمارگیری نەتەوەیی گەلانی ناوچەکە؛ واتە تاکو گرفتەکانی میللەتی کورد چارەسەر نەبن، هەرگیز خۆرهەڵاتی ناوەڕاست سەقامگیری بە خۆیەوە نابینێ. بۆ ئەمەش، مامۆستا نوورسی پێشنیازی زانکۆی زەهرا دەکات تاکو لە ڕووی زانستی و پیشەسازییەوە پێشبکەون و پێکەوەژیان و تەبایی ناو گەلانیش ببێتە بەردی بناغە.

«ئەم زانکۆیە بەردێکی بناغەیە بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا و دەبێ بە قەڵایەکی قایمی ئاشتی و ئاسایش لەوێدا، هەر وەک بە پشتیوانیی خوای گەورە گەلێ سوودیش لە بەرژەوەندیی ئەم گەل و وڵاتەدا بەرهەم دەهێنێت.»١١

٦- مردنی قوتابخانە ئایینییەکان

مامۆستا پێی وابووە حوجرە و خوێندنگە ئایینییەکان لەبەر ئەوەی خوێندنی هاوچەرخیان لەخۆ نەگرتووە، ئەوا ناتوانن بوونی خۆیان بپارێزن و ئەو سەروەری و کاریگەرییەی جارانیان نامێنێ. لەبەر ئەوە، بە بونیادنانی خوێندنگەی زەهرا دەبێ لە هەموو شوێنێک ئەو بیرۆکەیە بونیاد بنرێ تاکو لە کاروانی گەلان دوانەکەوین.١٢ لە کوردستاندا چەند زانای تر لە دوای سییەکانی سەدەی بیستەوە ئەم بیرۆکەیان هەبووە، بەڵام لە چوارچێوەیەکی سنووورداردا پیادەیان کردووە، وەک مەلای گەورەی کۆیە و مستەفا زەڵمی کاتێ لە سلێمانی مەلا بووە.

**مەرجەکانی زانکۆی زەهرا**

مامۆستا لە هەموو ئەو داواکارییانەدا کە پێشکەش بە دەسەڵاتدارانی کردوون، مەرجەکانی دامەزراندنی

ئەو خوێندنگەیەی خستووەتە ڕوو کە ئەمانەن:

١- ناوی «خوێندنگە»ی لێ بنرێ، چونکە ئاسایی و سەرنجڕاکێشە. دیارە خوێندنگە لەو کاتەدا (وەک ئێستایش) هێمای زانست و پێشکەوتن بووە.

٢- تێکەڵکردن و خوێندنی زانستە گەردوونییە نوێیەکان لەگەڵ زانستە ئایینییەکان.

٣- وانەکان بە هەرسێ زمانی (عەرەبی، کوردی، تورکی) بن.

٤- مامۆستاکان هەڵبژاردە بن و دەبێ کورد بن و لە هەردوو باڵی (زانست، ئایین)دا بەتوانا بن و جێگەی متمانەی زاناکانی کورد بن، بە لایەنی کەمەوە دەبێ زمانی ناوچەکە کە (کوردی)یە، بزانن تاکو خەڵکی ناوچەکە لەگەڵیاندا ئاشنا ببن و سوود لە زانست و توانا و بەهرەکانیان وەربگرن.

٥- ڕاوێژکردن بە ئامادەیی و لێوەشاوەیی و توانای کوردان و ڕەچاوکردنی سادەیی و دڵسافی و باری ڕۆشنبیرییان.

٦- یاسای (دابەشکردنی کار) بە تەواوی بچەسپێت تاکو لە هەر بەش و بوارێکدا چەندین پسپۆڕ و شارەزا دەربچن.١٣

٧- بێگومان ئەوانەی لەو زانکۆیەوە دەردەچن، دەبێ جێگە و بوارێک هەبێ کە خزمەتەکەی خۆیانی بەگوێرەی پسپۆڕییان تێدا تاو بدەن و بتوانن ڕۆڵێک لە پێشخستنی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵدا ببینن: ئەمەش بەوە دەبێ دەوڵەت ئەو دەرچوانە یەکسان بکات بە دەرچوانی خوێندگە و زانکۆکانی تر و بە هەمان جۆر ڕەفتاریان لەگەڵدا بکات.

٨- ویستوویەتی ئەو زانکۆیە بە بایەخپێدان و مشووری دەوڵەت بەهرەمەند ببێت و لە نێوان ئەو زانکۆ و دامەزراوە فەرمی و خوێندنگە باڵاکانی تری دەوڵەتدا هەماهەنگی هەبێت، بە جۆرێک، کە هەریەکەیان پسپۆڕیی بواری خۆیان لەگەڵ یەکتری بگۆڕنەوە بە مەبەستی پێگەیاندنی بەرەیەکی خوێندکاری دینداری هۆشیاری هاوچەرخی زانستپەروەر.

٩- گۆڕینی ئەو نەریتە بەردەوامەی کە لە کوردستاندا هەیە، ئەوەی کە خوێندن و فێرکردن بۆ تاکەکەسە و تایبەتە بە ڕەگەزی نێر، بەوەی کە گشتگیر بکرێت بۆ کۆمەڵ و بازنەیەک لە خەڵکان.١٤

**جێگەی دامەزراندنی**

لە ساڵی (١٩٠٨)دا بەدیعوززمان لە وتاریکیدا ڕوو دەکاتە لێپرسراوانی حکومەتی (ئیتیحاد و تەرەقی) و داوایان لێ دەکات کە زانکۆی زەهرا وێنەی زانکۆی ئەزهەر لە: (بەتلیس، وان، دیاربەکر) دابمەزرێت. دەوڵەتیش دڵنیا دەکات لە ئەجێنداکانی ئەم زانکۆیە، باسی هەوڵەکانی خۆی دەکات کە بە ناو ناوچەکانی کوردستاندا گەڕاوە و ڕای زانایان و خەڵکی کوردستانی وەرگرتووە و هەموان بێ جیاوازی پێیان باش بووە. لەبەر ئەوە دەڵێ: «لەم کۆششەمدا وەک لەجیاتیی خەڵکی کوردستان و بە ناویانەوە بم، وایە و گوزارش لە ئاواتەکانی ئەوان دەکەم. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە کوردان زۆر تامەزرۆی زانیاری و پێشکەوتنن.»١٥

دەرامەت

سەعیدی نوورسی

بێگومان ئەو زانکۆیە پێویستی بە داهاتێکی زەنگین هەیە. مامۆستا لەو کاتەدا کە بە ناو خەڵکدا گەڕاوە و باسی ئەم پرۆژەیەی کردووە، لێیان پرسیوە: تۆ باسی ئەم زانکۆیە دەکەیت، ئەی کێ دەرامەتەکەی باربوو بکات؟ دەڵێ: «دەرامەتەکەی بریتییە لە غیرەت و پەرۆشی.» دەیەوێ بەم وەڵامەی بڵێ: پێویستە ئەو زانکۆیە سەربەخۆ بێت و لە لایەن هیچ کەس و لایەنێکەوە نەقۆزرێتەوە و نەکرێتە خزمەتکاری هیچ لایەن و مەبەستێک، بەڵکو تەنها خزمەتی زانست بکات و ببێتە موڵکی ڕاستەقینەی خەڵک، ئەوانیش وەک ماڵی خۆیان مشووری بخۆن و وەک مزگەوت و فەقێیەکان بەڕێوەی ببەن، تا ئەو کاتەی دەکەوێتە سەر پێی خۆی، ئیتر ئەو کاتە پێویستی بەوان نامێنێ... خەڵک داوای ڕونکردنەوەی زیاتر دەکەن لەبارەی چۆنیەتیی ئەو لایەنەی کە داهاتەکەی لێوە کۆ دەکرێتەوە، دەڵێ دەرامەتەکەی لە چەندین لاوە دەبێت:

یەکەم: بەروبوومی موڵکە وەقفەکان

دووەم: زەکات

بەو پێیەی لە مەزهەبی شافیعیدا -کە مەزهەبی کوردانە- دروستە زەکات بدرێ بە قوتابیانی زانست، ئەوا دروستە بەم قوتابخانەیەش بدرێ، خۆ ئەگەر زەکاتی زەکاتەکەشی بدرێتێ، هێشتا هەر سەروزیادیەتی.

سێیەم/ نەزر و خێر و سەدەقە:

مامۆستا پێی وابووە ئەو زانکۆیە دەبێت بە سەرچاوەی ڕووناکی بۆ هەموو لایەک و بەری خزمەتەکەی دەگاتە هەموان، قوتابخانەی ئایینی و نوێ و هەم تەکیە و خانەقایشە، بەم جۆرە دەکرێ نەزر و سەدەقەکانیش ڕوو بکەنە ئەم قوتابخانەیە.

**سەرچاوە و پەراوێزەکان**


١- «داوەرییەکان» سەرجەمی پەیامەکانی نوور، بەرگی ٦، وەرگێڕ: فارووق ڕەسوڵ یەحیا، ل ٣٥.

٢- بدیع الزمان و فکرة الاتحاد الاسلامی، د. حسین چلیك/ ناونیشانی باسێکە کە لە کۆنگرەی جیهانیی سێیەم سەبارەت بە بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی بەشداریی پێ کردووە. ل ٥٣٥.

٣- ڕۆژنامەگەریی کوردی لە نێوان (١٨٩٨-١٩١٨)، نەوشیروان مستەفا.

٤- بدیع الزمان و فکرة الاتحاد الاسلامی، د. حسین چلیك، لە پەڕاوی المؤتمر الثالث (تجدید الفکر الاسلامی فی القرن العشرین)، لاپەرە ٥٣٥.


خزمەتەکانی بەدیعوززەمان مامۆستا سەعید نوورسی بە کوردستان و ئەو پرۆژانەی کە لە هەگبەکەیدا بوون و تەرخانی کردوون بۆ گەلەکەی، گەلێک زۆرن و لە هەردوو قۆناغی ژیانی کۆن و نوێیدا و بە دڵ و بە گیان بە کردەوە بێت یان بە ئامۆژگاری و نووسین، هەوڵی زۆری داوە بۆ هۆشیار و وریاکردنەوەی ڕۆڵەکانی گەل. شتی زۆر نوسراون بە زمانی تورکی و عارەبی، بەڵام جێگەی داخە کە بە کوردی شتێکی ئەوتۆی لەسەر نەنووسراوە.

جێی پەژارەیە کە لە پەڕاوی (زانایانی ئیسلام)دا خزمەتەکانی بدیع الزمان زۆر لە ئاستیان دابەزێنراوە و ئەوەی دەربڕیوە کە بەدیعوززەمان وەک پێویست خەم و مشووری لە میللەتی موسوڵمانی کورد نەخواردووە کە ئەو کاتە زۆر ستەمدیدە و لێقەوماو و چەوساوە بووە (بڕوانە ل ٢٣٦ی سەرچاوەی ناوبراو، دانراوی م. عەلی باپیر). لەم پرکێشییەشدا مامۆستای نووسەر (وەک زۆر لە نووسەرەکانی تر) هیچ خۆی ماندوو نەکردووە و بە درشتی بە سەر بابەتەکەدا ڕۆشتووە و وردتر لە ژیان و مێژووی خەباتی بەدیعوززەمانی نەکۆڵیوەتەوە. بەش بە حاڵی خۆم، کە بابەتی تایبەت بە بەدیعوززەمانم خوێندەوە، زۆر بەزەییم بە خوێنەری کورددا هاتەوە و لە خۆمم پرسی باشە ئەگەر قەڵەمێکی ئاوا بەهێز بەم جۆرە باسی بەدیعوززەمان بکات، ئەبێ خوێنەری سادە چۆنی لێ تێبگات؟! ئەگینا مێژووی ژیانی مامۆستا و ئەو بەڵگەنامانەی کە لە ڕۆژنامە و پەڕاوەکاندا هەن، چەندین نامەی ماستەر و دکتۆرا کە لەسەری نوسراون و تا ئێستا دەیان کۆنگرەی جیهانی بۆ توێژینەوەی ژیان و بیروڕاکانی لە چەندین شوێنی جیاوازدا بەستراون، نووسەرانیش توێژینەوەیان کردووە، بە تەواوی پێچەوانەی ئەو پرکێشییە خێرایە دەردەخەن. لە هەردوو بەرگی «داوەرییەکان» و «ژیاننامە»دا ئەم بابەتە بە درێژی باس کراون، بەڵام ئێمە لێرەدا بە کورتی باسمان کردووە، بە نیازم لە پەڕاوێکی سەربەخۆدا بە درێژی باسی ئەم بابەتە بکەم.

٥ «داوەرییەکان»، سەرجەمی پەیامەکانی نوور، بەرگی ٦، ل ١٠٣.

٦ «ژیاننامە»، سەرجەمی پەیامەکانی نوور، بەرگی ٩، ل ١٤٢.

٧ «ژیاننامە»، سەرجەمی پەیامەکانی نوور، بەرگی ٩، ل ١٤٣.

٨ ڕۆژنامەی (شرق و کردستان) ب/١٤٧، ١٩ی تشرینی دووەمی ١٩٠٨ /ل ١. «ژیاننامە»، بەرگی ٩، ل ١٤٠.

٩ ژیاننامە، ل ١٤٥.

١٠ ژیاننامە، ل ١٤٨، پاشبەندەکان، ل ٦٠٤.

١١ ژیاننامە، ل ١٤٨،

١٢ داوەرییەکان، مونازەرات، ل ٣٨١.

١٣ ژیاننامە، ل ١٥٢، داوەرییەکان، مونازەرات، ل ٣٨٢.

١٤ داوەرییەکان، ٣٨٥.

# ستراتیژیی چاکسازی بۆ پرۆسەی خوێندن لە دیدی بیرمەندی ناوازەی کورد

## بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی

**د. حەسەن خالید موستەفا موفتی**

ئاشکرایە کە زانای خوداناس مامۆستا سەعید نوورسیی کوردی (ڕەحمەتی خودای لێ بێت) لە چەرخی خوێدا و تا ئەمڕۆش بە بیرمەندی ناوازە و گەورەی جیهانی ئیسلام بە تێکرا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بە تایبەت دادەنرێت. بۆیە جگە لە سەرقاڵییەکانی لە بوارەکانی پێگەیاندن و تێگەیاندنی قوتابیانی نوور، هەروەها سەرقاڵی تەدریس و ئیرشاد و جیهادکردن بووە لەتەک نەفس و شەیتان و داگیرکەراندا بە هەموو جۆرەکانی تێکۆشان و جیهاد، واتە (بانگەواز و قەڵەم و شیر). وێڕای ئەمانە، مامۆستای ناوازە لە هەموو بوارێکی خزمەتکردن بە ئیسلام و موسوڵمانان و تەنانەت مرۆڤایەتییشدا ئەسپی خۆی تاو داوە و نەسرەوتنی هەڵبژاردووە و کردوویەتی بە دروشم. پاش ئەویش قوتابیانی نوور لە دونیای ئیسلامدا تا ئەمڕۆیش هەمان ڕێگە و ئامانجیان هەیە و لەو پێناوەدا هەوڵ دەدەن و تێدەکۆشن.

یەکێک لەو بوارانە کە عەللامەی نوورسی (ڕ.خ) هەردەم خەمی بۆ دەخوارد و لە هەوڵی نەبڕاوەدا بووە بە مەبەستی چاکسازی و تەبایی و لێکترنزیکبوونەوە، بریتی بووە لە جۆرەکانی قوتابخانەی ئایینیی شەرعی و تەصەوفی و پێشکەوتن و حەداسە، چ ئەوانەی کە سەر بە حوجرەی مزگەوتەکان بوون، چ ئەوانەی کە سەر بە تەکیە و خانەقاکان بوون، چ ئەوانەش کە دواتر پەیدا بوون و ناوی نوێخوازی و حەداسەتیان بۆ خۆیان هەڵبژارد.
مامۆستای پایەدار، پاش ئەزموونێکی کەموێنەی لە هەموو بوارەکانی زانستی نەقڵی و عەقڵیدا، بە پێگەیاندن و پەروەردەکرن و وانەگوتنەوە و دانانی دەیان کتێب و نامەی بەهێز و شەرح و ڕاڤەکردنی قورئان و سوننەت و تەعلیق و شیتەڵکاری و پەراوێزنووسین بۆ دەیان سەرچاوەی متمانەدار لە تێکڕای زانستەکاندا، هەروەها پاش خوێندنەوەی دروستی واقیعییانەی بۆ هەر سێ جۆری قوتابخانەکان، مامۆستا نوورسی سەرنج و تێبینیی خۆی یاداشت دەکات لە سەر ئەو قوتابخانانە و لە ئەنجامدا گەیشتە ئەو ڕاستییەی کە ئەمڕۆ موسوڵمانان پێویستیان بە هەر سێ جۆری قوتابخانەکان هەیە و دەتوانرێت بەو بیر و فەلسەفەیەی کە دای ڕشت، هەرسێکیان تەواوکاری یەکتر بن، نەک یەکتربڕ.
لە وەڵامدانەوەی پرسیارێکدا کە زۆر جار دەورووژێنرێت و دەگوترێت: لەو کاتەی کە ئیسلام نموونەی ڕاستەقینەی شارستانیەتە لە چەرخی بەرزی و پێشکەوتندا، بۆچی نەیتوانیوە وەک ئەم شارستانیەتەی کە ئەمڕۆ هەیە، پێشبکەوێت؟ واتە موسوڵمانان بۆ نەیانتوانیوە لەم چەرخەدا بگەنە ئاستی ئەو تەکنەلۆژیا و پێشکەوتنە مەعریفییەی کە خەڵکی تر هەیانە و شانازیی پێوە دەکەن؟
وێڕای ئەو ڕاستییەی کە ئەو شارستانیەتە شارستانیەتی مرۆڤایەتییە، تێکڕای مرۆڤەکانی سەر ڕووی زەوی لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ بە موسوڵمان و ناموسوڵمانەوە هەریەک لە بوار و جوگرافیا و ناوەندی خۆیدا جێگە و پێگە و دەست و زمان و مێشک و بیر و ئەندێشەی بە ئەندازەی خۆی هەبووە و هەیە و هاریکار بووە لە دروستبوونی ئەم شارستانیەتەی ئەمڕۆدا...
وێڕای ئەمە، مامۆستا نوورسی پێی وایە کە ئەگەر چاکسازیی ڕاستەقینە لە سەرچاوەی زانست و مەعریفەتدا بکرێت کە قوتابخانەکانی نێو جیهانی ئیسلامییە و هەرسێ قوتابخانە ئایینییەکان و قوتابخانە تەصەوفییەکان و قوتابخانە سەردەمییە میرییەکان هەماهەنگی یەکتر بن، دەکرێت ئەو شارستانییەتەی کە ئەمڕۆ لە جیهاندا هەیە، موسوڵمانان ڕابەرایەتیی بکەن، وەک چۆن لە زۆرێک لە چەرخەکانی پێشوودا ڕابەرایەتیی زانست و مەعریفەتی جیهانی مرۆڤایەتییان کردووە.
بۆیە شێخ سەعیدی نوورسیی کوردی دەفەرموێت: بە لای منەوە گرنگترین هۆکاری دواکەوتنەکە بریتییە لە جیاوازیی ڕا و بۆچوون و بیر و مەشرەبەکانی بەرنامەی خودی ئەو قوتابخانانە:
«أرى أن أهم سبب في ذلك هو: تباين الأفكار وتخالف المشارب بين أهل المدارس الدينية والمدارس الحديثة والزوايا»(سيرة ذاتية) بديع الزمان النورسي: ل: ٧٢).
واتە: خەڵکانی مەدرەسە ئایینییەکان خەڵکی سەر بە مەدرەسە نوێیەکان تاوانبار دەکەن بە لاوازییان لە بواری ئایین و عەقیدەدا. ئەمانیش، واتە ئەهلی قوتابخانە سەردەمییەکان، ئەوان تاوانبار دەکەن بەوەی کە بەرەو ڕووی زانستە نوێیەکان نەچوون و شارەزاییان لە زانستی سەردەمدا نییە. هەروەها ئەم قوتابخانە سەردەمییانەش ئەهلی قوتابخانە تەصەوفییەکانی سەر بە خانەقا و زاوییە و تەکیەکان وا نیشان دەدەن کە گوایە دەشوبهێن بە ئەهلی بیدعەت لە هەندێ هەڵسوکەوتی تاکەکانیاندا!
پاشان مامۆستا نوورسی وەڵامی ئەم تاوانبارکردنەیان دەداتەوە و دەفەرموێت: «ئەم بۆچوونەیان بەرامبەر ئەهلی خانەقاکان تەنها لەسەر گومانێکی نادروستی ناحەق بۆ دروست بووە، چونکە نازانن کە عەوامەکانیان لە

سەعیدی نووری

دائیرەی موباحدا لە دەرەوەی زیکرەکان هەندێک هەڵسوکەوت دەکەن کە ئەمە تەنها بۆ ڕازاندنەوە و تەشویق و هاندانی خەڵکە بۆ یاد و زیکری خودا، واتە کارێکی بیدعەت و خراپ نییە، بەڵام ناشاردرێتەوە کە بە هۆی کردنەوەی دەرگای ئاسانکاری و ئەمپەڕگرتنی ئەمان و ئەوپەڕگرتنی ئەوان هەندێک کاری ناشایستە تێکەڵ کراوە، بە هۆی لێکترازانی ئەم قوتابخانانە بە تێکڕا لە بیر و بۆچوون و مەشرەب و خواستەکانیان ڕەوشتی ئیسلامەتی بە شێوازێک لە شێوازەکان داچڵەکا و پەرتەوازە بوو، بەو هۆیەیشەوە موسوڵمانان لە کاروانی شارستانییەت و مەدەنییەت دواکەوتن.»
پاشان دەفەرمووێت:

**«وعلاج هذا: تدريس العلوم الدينية في المدارس الحديثة تدريساً حقيقياً، وتحصيل بعض العلوم الحديثة في المدارس الدينية في موضع الحكمة القديمة التي أصبحت لا ضرورة لها... وكذا تواجد علماء متبحّرين في التّكايا... ويؤمل أملاً قوياً بعد هذا أن تصبح هذه المرافق الثلاثة جهازاً متناسقاً يقطعُ المراتب نحو الرّقي والتقدّم». (سيرة ذاتية) بديع الزمان النورسی: ل: ٧٢).**

واتە: بۆ چارەسەری ئەم کێشە و کێشمەکێشە لەپێناو هەستانەوەی شارستانیەتی ئیسلام و پێشکەوتنی موسوڵمانانندا، پێویستە ئەم ستراتیژە بگیرێتە بەر لە نێوان هەرسێ جۆر قوتابخانەکانی جیهانی ئیسلامی بە گشتی و دەوڵەتی ئەوسای کەمالیزمی میراتگرەوەی سەڵتەنەتی عوسمانی کە ڕوونی دەکاتەوە، ستراتیژەکەیش بریتییە لەوەی: «پێویستە زانستە ئایینییەکانی قوتابخانە ئیسلامییەکانی سەر بە مزگەوت و حوجرە و خانەقاکان، بە ڕاستی و دروستی بخرێنە نێو پرۆگرام لە قوتابخانە نوێ و سەردەمییەکاندا کە حکومەت دروستی کردوون، هەروەها بە مەبەستی ڕاگرتنی تەوازون و هەماهەنگی و لێکتێگەشتن و تەواوکاری، هەندێک لە زانستەکانی سەردەم کە خزمەت بە دونیای مرۆڤایەتی و پێشکەوتنیان دەکات، بخرێتە پرۆگرامی قوتابخانە ئایینییەکانەوە و لەبری وانەی (لۆجیک و حیکمەتی یۆنانیی کۆن) کە ئێستا ئەو بایەخە زانستییەی نەماوە، با ئەو زانستە سەردەمییانە بخوێنرێن و ئاڵوگۆڕیان پێ بکرێت، هەروەها ڕۆڵی پڕ بایەخی زانا گەورە قووڵداچووەکانی دونیای زانست و مەعریفەت و ڕەوشتی نێو نێوەندی تەکیە و خانەقاکان نابێت لە بیر بکرێت لەو پرۆسەدا.» (واتە پێویستە زانستی ئەوانیش بە تایبەت لە بواری تەصەوف و سلوک و عیرفاندا گرنگیی پێ بدرێت و بخرێتە نێو پرۆگرامی قوتابخانە سەردەمییەکانەوە...)
پاشان دەفەرمووێت:

«هیوایەکی زۆر بەهێز هەیە ئەگەر بەو شێوەی کە گوتمان، هەماهەنگی هەبێ لە نێوان هەر سێ جۆر لە قوتابخانەکاندا، ئەو کات ئەو سێ ناوەند و پێگەیە پێکەوە ببنە دەزگایەکی زۆر یەکڕیز و پتەو و هاوکار کە بتوانێت قۆناغەکانی شارستانییەت ببڕێ بەرەو بەرزی و پێشکەوتن.»

ئێستایش ئەگەر هەمان ستراتیژی مامۆستا نوورسی بە ڕاستی و دروستی لە قوتابخانە و کۆلێژەکان و ناوەندە شەرعی و یاسایی و مەعریفی و عیرفانی و ئەکادیمی و ڕۆشنبیرییەکاندا پیادە بکرێت، موسوڵمانان لە جیهانی ئیسلامدا لە تێکڕای بوارە زانستی و مەعریفییەکاندا دەتوانن بە پیادەکردنی ئەو ستراتیژە هەنگاوێکی جۆریی یەکجار گەورەی وەها بنێن کە جێگەی سەرسووڕمانی ناوەندەکانی

شارستانییەتی سەردەم بێت لە دونیادا، هەر وەک چۆن داهێنانی زانایانی موسوڵمان لە چەرخی زێڕینی ئیسلامیدا جێگەی سەرسووڕمانی پادشا و نێوەندەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بووە.
خودای گەورەش هاوکاری دڵسۆز و چاکەخواز و چاکساز و زانستخوازانە.

پرۆفیسۆری یاریدەدەر لە زانکۆی صلاح الدين، هەولێر
٢٢ شوال ١٤٣٧ک- ٢٨ تموز ٢٠١٦ز
yahoo.com@Hasanmufty٢٠٠٠

# ناوازەیی بیری مامۆستا سەعیدی نوورسی

**حەبیب موحەممەد سەعید**

لە کۆتا ساڵەکانی شەستەکاندا بۆ یەکەم جار ناوی مامۆستا سەعید نوورسیم بەرگوێ کەوت و لە کتێبێکی خنجیلانەدا خوێندمەوە، کەمێ شارەزای ژیانی بووم. دواتر وردەوردە -بە درێژایی ساڵانی حەفتاکان و هەشتاکان- لەم کتێب و لەو گۆڤارەوە خەریک بووم و تا ڕادەیەک شارەزای ژیان و بەرهەمەکانی کە پێیان دەوترێ (پەیامەکانی نوور)، بووم.

ئەوکات وردەوردە نووسینەکانی دەکران بە کوردی و بڵاو دەبوونەوە. منیش دەمخوێندنەوە و هەرچی سەرنجی پەیامێکیم دەدا، دەمبینی شێوازی نووسینەکەی زۆر سەیرە، لە شێوازی ئەم چەرخە ناچێت و چارەسەری پەروەردەی دڵ و ڕۆح دەکەن و گشت هەستە ناسک و نیانەکانی مرۆڤ دەحەسێننەوە.

ئەوسا بڕیارم دا ژیانی ئەم کەڵەزانا هاوچەرخە موسوڵمان و شۆڕەسوارە بەجەرگەی کوردان، خواناس و خزمەتگوزاری ئیسلام، بناسین و ئاگاداری بین و بە کۆمەکی خوا بە دەوروبەرمانی بناسێنین، چونکە شەرمەزارییە ئێمە لێی شارەزا نەبین و نەیناسین، بگرە بە کوێرانە و بەوپەڕی گێلییەوە دژی بیرە ڕووناکە ئاشتیخوازەکەی بوەستینەوە، لە کاتێکدا پەیامەکانی دەگەنە سەرانسەری جیهان و بەگشت

زمانێک بڵاو دەبنەوە.
سەرنجم دا لەو کاتە ناسکەی مێژووی ئیسلامدا (سەرەتاکانی سەدەی ڕابوردوو) و لەو شوێنە گرنگەی وڵاتی موسوڵماناندا، مامۆستا بە تاقی تەنها، وەک شێری بێشە، لە بەردەم ستەمکاراندا وەستاوە و بێپەروا بیروباوەڕی ئیسلام و ڕاستییەکانی قورئان و ئیمان پێشکەش بە دڵە تینووەکان دەکات.
لەم هەڵویستەی دا، مامۆستا مەردانە و بێپەروا لەسەر کاری ژیرانە و شەرعییانەی خۆی بەردەوام بوو، ئەگەرچی دوژمنانی وڵاتی ئیسلام بە ناڕەوا تاوانباریان دەکرد و دەمێ بەند و دەمێ ڕەهەندە و دەمێ بەردەم دادگا و دەمێ بە ئیقامەجەبری ئازاریان دەدا.
کاربەدەستە دنیاپەرستەکانیش تا زیاتر ئازاری مامۆستای غەریب و تەنها و پیر و لاواز و نەخۆشیان دەدا، ئەمیش زیاتر لەسەر بەرزکردنەوەی دەنگی ئیمان سوور دەبوو و ئەمپەڕ و ئەوپەڕی وڵاتی پڕ دەکرد لە پەیامە ئیمانییەکانی تا ڕۆڵە ماندوو و ستەملێکراو و سەرگەردانکراوەکانی موسوڵمانان ئاورێ بە لای ئیمانەوە بدەنەوە و بە ویست و هەڵبژاردنی خۆیان بۆ سەرچاوەی فێنک و زوڵاڵی قورئانی پیرۆز بگەڕێنەوە.
بەم شێوەیە، تا کۆتایی تەمەنی لەسەر کاری پیرۆزی بەردەوام بوو، ئەو کارەی کە بۆ ئەم چەرخە و لەمەودواش خراوەتە ئەستۆی. ئەوە بوو دوای ڕەنج و زەحمەت و مەینەت و ماندووبوونێکی تەواو تەمەنی بەسەر برد، بێ ئەوەی ساتێ نەرمی بۆ مولحید و دوژمنانی ئیمان دەربخات.
ئەگەر سەرنج لە نووسینەکانی مامۆستا بدەین، دەبینین هەریەکەیان بۆ خۆی سەراسیمایەکە لە دەربڕین و نووسینەوە و فیکرەکانیدا. ئەوە پەیامی (بیماران) ە کە بیستوپێنج دەرمانی ناوازەی مەعنەویی وەک مەڵهەمی ساڕێژکەری برینەکان دەبەخشێت بە نەخۆشەکان و پێش هەموویان خودی خۆی.
یان پەیامی (پیران)ە کە جوانترین دڵدانەوە و سەبووریی مرۆڤە لە دەمی پیربوونیدا کە لێرەشدا مامۆستا بە بینینی تاڵەمووە سپییەکانی خۆی دوای چل ساڵێک لە تەمەنی و دروستبوونی هەستی ترسناکی پیری و مردن دڵی خۆی داوەتەوە و ئەو هەستانەی بۆ هاتوون.
یاخود (پەیامی حەشر)ە کە حەقیقەتی ڕوودانی ڕۆژی ڕەستاخێز و حەشر بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی وەها دەچەسپێنێ کە تەنانەت فەیلەسوفێکی وەک (ئیبن سینا)ش دەستەوسان بووە لەو چەسپاندنەدا و وتوویەتی (الحشر ليس على مقاييس عقلية). بەڵام مامۆستا بە کۆمەکی نووری ئایەتێکی قورئان و پاش چل جار خوێندنەوەی، توانیی بە دوازدە وێنە و دوازدە ڕاستیی گومانبڕ ئەو کێشەیە چارەسەر بکات.
یاخود لە پەیامی (ئایەتولکوبرا- بینینەکانی گەشتیارێک)دا بە وردی سەرنجی مامۆستای گەشتیارم دەدا کە چۆن بە پلە ئیمانییەکاندا سەردەکەوت و پلە لە دوای پلە شارەزایی زیاتر دەبوو و تا لە ئەنجامدا گەیشتە پلەیەک کە بتوانێ نەخشەی پێویستی ئەم چەرخە بۆ بانگەوازی ئیسلام بکێشێ!
دوای ئەوە نۆبەی پەیامی (ناوی هەرەمەزن - ئیسمی ئەعزەم) هات کە بە شێوازێکی زۆر مەعنەوییانە باس لە درەوشانەوەی شەش ناوی جوان و هەرە مەزنی خوای گەورە دەکات لەم گەردوونەدا و پاش تەواوکردنی، دڵم پڕ بوو لە متمانە کە: ئەم نووسینە لەو جۆرە نووسینە ئاساییانە نییە کە ئێمە دەیزانین، بەڵکو زانستێکە بە ئیلهامی خوایی پێشکەشی کراوە بە هۆی خواپەرستییەکەیەوە. بەپێی بەڵێنی ئایەتی پیرۆزی قورئان [واتقوا الله و يعلمكم الله]. کەواتە مامۆستا نوورسی، بە چاودێریی خوایی، بۆ کارێکی گەورە و پیرۆز هەڵبژێردراوە و پەروەردە کراوە بۆ تازەکردنەوەی کاروباری ئیسلام (نوێخوازی).
ئەوەی کە زۆر سەرنجی ڕاکێشام لەم پەیامەدا، ئەوەیە کە: ناوە پیرۆز و گەورەکانی خوا لای

سەعیدی نووری

سەرداری ئەولیایان حەزرەتی ئیمامی عەلی (خوا لێی ڕازی بێ) هەر ئەو شەش ناوەن کە نووریان بۆ مامۆستا نوورسییش دەرکەوتووە، لێرەدا لە پایەی بەرزی مامۆستا نوورسی شتێک تێگەیشتم، ئەمەش پاڵی پێوە نام بپرسم: تۆ بڵێی بتوانین بڵێین: (ئیمامی عەلی کەوانەیەکی کردووەتەوە و مامۆستا نوورسییش دای خستووە) وەک ئەوەی ئیمام سەرەتا و مامۆستاش کۆتایی دوو زنجیرە نوورانییەکە بن؟! (دوو زنجیرە نوورانییەکە بریتین لەو نەوە و وەچانەی کە لە حەزرەتی حەسەن و حوسەینەوە کەوتوونەتەوە، کە بە درێژایی مێژووی ئیسلام پیاوی زانا و خواناسی زۆریان لێکەوتووەتەوە، مامۆستا نوورسییش لە سەری باوکیەوە حەسەنی و لە سەری دایکیشیەوە حوسێنییە خوا لێیان ڕازی بێت، بۆیە وا بووە بە میراتگری هەردوو زانستی عەقڵ و دڵ.)

ئەم جارە نۆرەی چاپکردنی پەڕاوی (مەسنەویی نووری) هات کە بەرگی هەشتەمی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)ە و بریتییە لە کورتەی بیری پەیامەکان و شەتڵگەیانە. مامۆستا لە دواساڵانی سەردەمی عوسمانییەکاندا دایناوە و بە ڕاستی دەریایەکی زۆر بەرفراوانی زانست و دانستەکانە و زانستگەلێکی خەست و چڕوپڕی ڕۆحییە، مەلەوانی خۆی دەوێ کە دەستی بەو میوە و بەرهەمە نایابە بەرز و بڵندانەی بگات.

زۆر زۆر پێی سەرسام بووم... ئەم نووسینە خەست و چڕە، هەزار حەیف، هەرکەسێ دەستی دەداتێ و لێی تێناگا، ڕاستەوخۆ پشتی تێدەکا، لەجیاتیی ئەوەی بگەڕێ بۆ پەیژەی سەرکەوتنی ئەو بەرزاییە سەختە.

لە ڕاستیدا ئێمە پێویستمان بە دڵ و دەروون و گیانێک هەیە کە ئەوەندە بەرز و شارەزا بێت، بتوانێ میوەی بێستانی ئەم بەرهەمە نایابە بچنێتەوە، ئەگینا بە ناڕەوا خۆمان کردووە بە جێگەداری پێشینە ئیماندارەکانی ئەم ئوممەتە.

لە ئەنجامی خوێندنەوە و سەرنجدانی بۆچوون و هەڵوێستەکانی مامۆستا نوورسی لە پەیامەکانی نووردا هەندێ شتی سەیر و ناوازە و جوانمان بەدی کردووە کە جێی سەرسوڕمانن، حەزمان کرد بەپێی توانا گرنگەکانیان زیاتر ڕوون بکەینەوە:

**هاوبەشی لە کاری قیامەتیدا:**

مامۆستا نوورسی ڕێبازێکی ناوازەی لە قورئان و سوننەت هەڵگۆزیوە لەبارەی کاری ئیماندارەوە لەم سەرزەوییەدا کە دەبێ بە بیر و هەستی دەستەجەمی و کۆمەڵییەوە کار بۆ ئیسلام بکرێ، تەنانەت خواپەرستی و کاری کەسی ماوەی تەنهایی تیا نییە. مامۆستا بۆ ئەم بۆچوونەی نموونەی (پێنج) کەسمان بۆ دێنێتەوە کە یەکێکیان نەوت و یەکێ فتیلە و یەکێ شووشەی چرا و یەکێ چراکە و یەکێکیشیان شقارتەیان ئامادە کردووە تا بە هەموویانەوە و بە هاوبەشی چرایەکی نەوت بە دەست بێنن. کاتێ کە دای دەگیرسێنن، وەک ئەوە وایە هەریەکە خاوەنی چرایەکی تەواو بن. کاری قیامەتییش هەر بەم شێوەیەیە و هیچ موسوڵمانێ بە تەنها سەرکەوتوو نابێت بۆ مسۆگەرکردنی قیامەتی تاکو هاوبەشیی براکانی نەکات، بۆ نموونە کاتێ کە موسوڵمان نوێژ دەکا (ئەگەرچی بە تەنها و لە شوێنێکی چۆڵیشدا بێت) کە دەڵێ: [إیاک نعبد و إیاک نستعین] ئەوە دەگەیەنێ هاوپەیمانی کۆمەڵێکی زۆر گەورەیە و بە هەموویانەوە لە خواپەرستیدا هاوبەشن و بە یەک دڵ و یەک زمان هاوار لە پەروەردگار دەکەن بۆ هیدایەت و گرتنی ڕێگەی سەرفرازی. (وەک لە مەکتووبی ٢٩یەمدا باسی کردووە، کە مامۆستا سەرنجی نوونی (نعبد) دەدات و لەناکاودا گەورەیی و پڕ دانایەتیی نوێژی بەکۆمەڵی بۆ دەردەکەوێ، لە مزگەوتی (سوڵتان بایەزید)ی ئەستەنبووڵەوە هەموو ئەهلی مزگەوت بوونە شایەت و پشتگیری یەکتر بۆ نوێژەکانیان و پاشان وا هەموو مزگەوتەکانی ئەستەنبووڵ بەیەکەوە بەستران و هەموو شار وەک یەک مزگەوتی لێ هات و هەموان بوون بە تکاکار و پشتگیریکەری یەکتر. ئینجا سەرنجی کەعبەی پیرۆز دەگرێ کە هەموو موسوڵمانانی سەر زەوی بە دەوریدا ئەڵقەی نوێژیان بەستووە و سوپاسی خوای گەورە دەکات و دەڵێ [الحمد لله رب العالمین] لەسەر ئەو هەموو تکاکار و پشتگیریکەرە، کە کەعبەی پیرۆزی وەک میحرابی مزگەوتێکی گەورەی لێ هاتووە کە هەموو سەرزەوی بێت. بۆیە خێرا شایەتمانێک دەهێنێت

تا بە سپاردە لە لای بەردە ڕەشەکەدا تەسلیمی بکات و ئەو هەموو نوێژخوێنەش لەسەری بە شایەت بگریٚ!! بۆیە نوێژکردنی بەکۆمەڵ خێری زیاترە لە تاک. یان ڕۆژوو لە ڕەمەزاندا خێری زیاترە تا لە مانگەکانی تردا.

ئا لێرەدا خۆویستی (ئەنانییەت) سەرکوت و ڕیشەکەن دەبێت و هەر خزمەتێک ئیماندارێک ئەنجامی بدا، ئیمانداران خۆیان بە هاوبەشی ئەو خزمەتە دەزانن و «من» و « تۆ» لە هیچ کارێکدا دروست نابێت و گەورە و بچووکی دەوری نابێت. چونکە بەپێی دەستووری (یەکخستنی ئیش و دابەشکردنی کار) بە نهێنی ئیخلاس و برایەتی و یەکێتی، هاوبەشی و پشتگیری و کاردابەشکردن دێتە کایەوە. لەم کارە کۆمەڵییە نوورانییەدا ئیمانداران هەست بە حەسوودی و ئیرەیی ناکەن، چونکە وەک کۆمەڵەڕاوچییەکیان لیٚ هاتووە کە بڕیاریان داوە هەرچییان ڕاو کرد، تیایدا هاوبەش بن. ئیتر هەر ڕاوچییەک ڕاوی زۆری کرد، ئەوا دەبێتە خۆشەویستی هەموان، نەک پیناخۆشبوون، کەواتە لۆمە و سەرکۆنەکردنی یەکتری لەسەر دواکەوتن و کەمتەرخەمیکردن دەبێت لە کاردا تاکو بەرژەوەندیی هەموان زیانی پیٚ نەگات.

ئەم بۆچوونە لە کویٚ لەچاو ئەو بۆچوونەدا کە هەر کەسیٚ بۆ ناو و شۆرەتی خۆی هەوڵ بدا و هەر کەسیش پێشی بکەویٚ، بە چاوی حەسادەتەوە سەیری بکات؟! ئا لێرەوەیە خۆویستی و سیاسەتبازی سەردەردەهێنن و بەرگری لە نەفسی خراپکاردا پەرە دەسێنیٚ و هەر کەس هەوڵ دەدا هەموو کەس و دەستەیەک بشکێنیٚ تا خەڵکی لە دەوری خۆی و بۆچوونەکانی کۆ ببنەوە.

**حیکمەتی ژنهێنانی:**

ماموستا لە ژیانیدا ژنی نەهێناوە کە بە ڕواڵەت پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەری خوایە (درودی خوای لەسەر بێت)، جا لە ژیانیدا پرسیاری ئەوەی لیٚ کراوە کە بۆچی ژنی نەهێناوە، ئەویش لە وەڵامدا دەری بڕیوە کە:

یەکەم: لەبەر ئەوەی لەم چەرخەدا هێرشێکی خوانەناسانەی زۆر سەخت و ناهەموار دەکرێتە سەر ئیمانداران، پێویستە کۆمەڵێک زۆر بە چاکی خۆیان بەخت بکەن و بە چالاکی بچنە مەیدانی بەرپەرچدانەوەی ئەو هێرشەوە، ئەویش خۆی بە یەکێک لەوانە دەزانیٚ. بەڵیٚ ژنهێنان سوننەتی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێت) بەڵام لەو ڕۆژگارە سەختانەدا ڕای دەگەیەنێت کە نەک ژنهێنان، بەڵکو ئەگەر دە حورالعینیشی پیٚ بدریٚ، خۆی بە ناچار دەزانیٚ دەستیان لیٚ هەڵگریٚ لەپێناوی خزمەتکردنی ڕاستییەکانی قورئاندا.

دووەم: هەندیٚ زانا و خواناس، لەبەر بەخێوکردنی ماڵ و منداڵ ناچار بوون بە سەرگەردانی فەتوا بۆ بیدعە بدەن و پشتگیریی لیٚ بکەن. جا لە بارودۆخی ئاوادا وازهێنان لە سوننەتێک چاکترە بۆ موسوڵمان تاکو ئەوەی بکەوێتە ناو گوناهی گەورەگەورە و دەستبەرداری چەندەها فەرز و سوننەتی تر ببیٚ.

سێیەم: ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە فەرمان بە ژنهێنان دەدەن، فەرمانی واجب نین، بەڵکو فەرمانی (موستەحەبب)ن، ئەویش لەگەڵ بوونی مەرجە پێویستەکانیدا کە ڕەنگە بۆ هەموو کەسێک و لە هەموو کاتێکدا دەست نەدەن.

چوارەم: زۆر لە خواناسانی پێشین و شارەزایانی قورئان و سوننەت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو خۆیان لە خەڵکی کەنار گرتووە و چوونەتە چۆڵەوانی و ئەشکەوتەوە بۆ ئەوەی دڵ و دەروونیان بە چاکی پەروەردە بکەن و لە کۆت و زنجیری دنیا ئازاد ببن. جا ژنهێنانیش لەم ڕۆژگارانەدا هەندیٚ لەو کۆت و زنجیرانەی بەدواوەیە کە لەوانەیە هەندیٚ کەس لەوە بخەن کاری گەورەی زۆر پێویست ئەنجام بدەن.

پێنجەم: جا کە پیاوچاکانی پێشین «تەنها بۆ خۆیان» توانیبێتیان دەست لە دنیا بشۆن، کەواتە کەسێک بگاتە فریای بەختەوەریی هەمیشەیی خەڵکێکی یەکجار زۆری سەرگەردان و هەوڵی ئەوە بدا هێز و پێز بە ئیمانیان بدات، تا بتوانیٚ خزمەتی ڕاستەقینەی

سەعیدی نوورسی

قورئان بکات، مرۆڤێکی ئاوا خۆنەویست چۆن دەبێ لێنەبڕێ تا ئەو کارە گرنگەی ئەستۆی ئەنجام بدا؟ دەستوورێکی شەرعییش هەیە کە دەڵێ: [ما لا یتم الواجب الا بە فهو واجب] واتە: ئەنجامدانی هەر واجبێکی شەرعیی بەسترابێ بە کارێکی ترەوە، ئەنجامدانی ئەو کارە واجب دەبێ لەپێناوی ئەنجامدانی واجبەکەدا.
جا سەرنج بدەن بۆ ئەنجامدانی کاری نوێخوازی لە کاروباری ئیسلامدا بۆ ئەم چەرخە ناهەموارە کە لافاوی ئیلحاد و خوانەناسی سەر زەوییان داپۆشیوە و تەنگیان بە مرۆڤایەتی هەڵچنیوە، چەندە واجبێکی گەورەیە؟! بەو شێوەیەش لێبڕان و دەستتشۆردن لە بەرژەوەندی و لەزەت و ڕابواردنی دنیای فانی واجب دەبێت.
مامۆستا خۆیی بە ناچار زانیوە دەست لە ژن و ماڵ و منداڵ بشوا تا کارەکەی ئەنجام بدات، ئەو کارەی کە تا ئێستا بە کەسی تر بەو ڕادە و ڕێژەیە ئەنجام نەدراوە... خوای گەورەش کۆمەکی کرد و ئەو ڕەهەندەیی و دەربەدەری و غەریبی و بێکەسییەی هێنا بەسەریدا تا ئەوەندەی تر یەکلایی بێتەوە بۆ خوا، ئیتر خۆتان حوکم بدەن: ئایا کە مامۆستا نوورسی ژنی نەهێناوە، پێچەوانەی سوننەت جووڵاوەتەوە؟! ئایا ماوەی هەبووە ژن بێنێ؟ ئایا دەستی لە هەموو بەرژەوەندییەکی تری خۆی نەشۆریوە بۆ ئەوەی یەکلایی بێتەوە بۆ خزمەتی قورئان؟!

**نەویستنی بەهەشت:**

لە ئیسلامدا خەڵکان بۆیە خوا دەپەرستن و نوێژ دەکەن تا کە مردن، بچنە بەهەشتی نەبڕاوەوە، بەڵام هەندێک هەن (کە دەگمەنن) ئامادەن واز لە هەموو خۆشی و شادییەکی ئەم دنیایە و تەنانەت قیامەتیش بهێنن لەپێناو سەرفرازی و بەختەوەریی ئەوانی دیدا... ئەمە جوانترین ڕەوشتی خۆنەویستییە...
بۆ نموونە: صدیقی ئەکبەر حەزرەتی ئەبووبەکر -خوا لێی ڕازیی بێت- لە خوای گەورە دەپاڕێتەوە کە: ئەوەندە لاشەی گەورە بکا تا ببێتە پڕبەپڕی دۆزەخ و جێگەی تاقە کەسێکی تری تێدا نەبێتەوە و ئەو ئامادەیە بە تاقی تەنها لە دۆزەخدا بسووتێت بۆ ئەوەی دۆزەخییان هەر هەموویان ڕزگاریان ببێت؟!

مامۆستا نوورسییش -وەک لە پەیامی ئایەتولکوبرادا- دەری بڕیوە، پلەبەپلە سەرکەوت تا ویلایەتی کوبرا، تا بگاتە ئاستێک نەک تەنها دەست لە دنیا و بەرژەوەندییەکانی بشوات، بەڵکو بگاتە ئەو ڕادەیەش ئامادە بێت دەست لە قیامەتیش هەڵگرێت لەپێناوی گەیاندنی ڕاستییەکانی ئیماندا بە مرۆڤایەتی تا بە کۆمەکی خوا لە تیاچوونی هەمیشەیی ڕزگاریان بێت. کە بۆ یەکەم جار ئەم وتە و هەڵوێستەی مامۆستام بەرچاو کەوت، زۆر سەرم سووڕ ما و بە کوڵ گریام بۆ ئەو لێبڕانە! بە ڕاستی ئەمە هەنگاوێکی قورسە ناویەتی و دەزانم بە لای ئێوەشەوە هەر زۆر سەیرە، چونکە کە مرۆڤ قیامەتی نەما، ئەی ئیتر بۆچی هەوڵ دەدا؟ بە تەرازوو و پێوانی ئێمە وایە!
ڕەنگە هەندێ خۆشەویستیش وا بزانن ئەمە زیادەڕەوییە لە ئیسلامدا، نا خۆشەویستان، ئەمە کاکڵەی ئیسلامەتییە، ئەمە چڵەپۆپەی ئیمانە! بە

تایبەت لە وڵاتێکدا کە نەخشەی ڕیشەکەنکردنی ئیسلام لە ئارادا بێ.
بەڵێ ئازیزانم! بۆچوونمان بۆ ئیسلام ڕاستکردنەوەی دەوێ... ئیسلام تەنها بۆ دەسەڵاتی دنیا نەهاتووە، مامۆستاش وەک قوتابییەکی شانەهەڵگرتووی حەزرەتی ئەبووبەکر بڕیار دەدا کە ئامادەیە دەست لە بەشی قیامەتی هەڵگرێ. ئەمەش خۆی ڕوونی دەکاتەوە کە بەشکوم پریشکێکی پاڕانەوە پیرۆزەکەی ئەوی بەرکەوتبێ.

**کارمەندانی پاکژی:**

زانست خۆی لە خۆیدا شتێکە و پەیبردنی زانایان و پلەی زانستییان و ڕادەی پێکانیان شتێکی ترە، چونکە مەرج نییە مرۆڤ پەی بە هەموو ڕاستێتیی زانست ببات. بۆیە هیچ چەرخێک ناتوانێ ڕای بگەیەنێ کە ئاگاداری تەواوی زانستەکانە، لەبەر ئەوەی چەرخی دوای ئەو هەندێ لایەن دەردەخات کە لەوەوپێش نەزانراوە. لە لایەنی ترەوە پێشکەوتنی زانست بریتییە لە ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی مرۆڤ، یان تەواوکردنی زانینەکانی (بۆ نموونە: ڕۆژێک بوو زەوی بە چەقی بوونەوەر دادەنرا، دواتر هاتنە سەر ئەو ڕایە کە خۆر چەقی بوونەوەرە، ئەوەیش درایە دواوە.) کەواتە زۆر ئاساییە زانایان هەڵەی زانستییانە بکەن و دەیان ساڵیش لەسەری بەردەوام بن. بۆیە مامۆستا نوورسی ئەم ڕاستییانە دەخاتە بەرچاوان تا مرۆڤایەتی هۆشێک بکاتەوە و بزانێ تەنها خوای گەورە شایانی پەرستنە.
سەرنجم دا مامۆستا خاوەنی چەند ڕایەکی زۆر ناوازەیە و وەک مەلەوانی زۆر لێهاتوو کە لە بنی بنەوەی دەریادا گەوهەری دەگمەن و پەیپێنەبراو دەردێنێ، ئاوەها لە قورئانی پیرۆز و حەدیسی بێگەرد ڕای جوانجوانی دەرهێناوە و بۆیە منیش بە چەند خاڵێک دەیانخەمە بەردەستی ئازیزانی کوردزمان تا لە مامۆستای هەڵکەوتوویان شارەزا بن کە توانیی لە گەلێک بواری زانستیدا پەنجە لە هەموو مرۆڤایەتی بەرز بکاتەوە و هەڵە زانستییەکانی بۆ ڕاست بکاتەوە، ئەگەرچی لە زانکۆکانیشدا نەیخوێندووە، بەم جۆرە:
١- ئەو زیندەوەرانەی کە پەروەردگار بە ژمارەیەکی یەکجار زۆر دروستیان دەکات، کاری زۆر گرنگیان لە ئەستۆدایە. ئەوەتا هەر (پەرتووک)ێک تا تیراژی زۆر و ژمارەی لەچاپدانی زیاتر بێت، پڕفرۆشترە و نرخی بەرزترە. کەواتە زۆریی مێش بەڵگەی ئەوەیە کە کاری زۆر گرنگی پێ سێرراوە کە پەیوەندیی بە ژیانەوە زۆرە. جا کە تا ئەمڕۆ زانستی مرۆڤایەتی پەیی پێ نەبردووە، بگرە بە پێچەوانەوە، لێی تێگەیشتووە، ئەوە ئارامیی پێویستە تا ئاستی مرۆڤ بەرز بێتەوە.
٢- مێش هەمیشە خەریکی پاککردنەوەی دەم و چاو و باڵەکانیەتی، هەروەک دەستنوێژ بگرێت، کەواتە بێگومان ئەم گیاندارانە دەبێ کاری زۆر مەزن و گرنگ خرابێتە ئەستۆیان، زیاد لەو زیکر و تەسبیحەی کە خەریکی دەبن.
ئەوەبوو مووسا پێغەمبەر -سەلامی خوای لێ بێت- لە حزووری خوای گەورەدا دادی کرد کە: بۆچی نەوە و وەچەی ئەم بەدیهێنراوە بێزارکەرانەی ئەوەندە زۆر کردووە؟ بە ئیلهام وەڵامی درایەوە: تۆ جارێک ڕەخنەت لە مێش گرت، کەچی ئەوان زۆر ئەم پرسیارە دووبارە دەکەنەوە: پەروەردگارمان! ئەم مرۆڤە کەتەیە و خاوەنی ئەم سەرە زلە تەنها بە تاقە زمانێک زیکری تۆ دەکات و بگرە جارجاریش بێئاگا دەبێت لە زیکر. جا ئەگەر تەنها بە ئەندازەی سەری ئەو بەدیهێنراوی وەک ئێمەت دروست بکردایە، ئەوا بە هەزارەها زیکریان دەکردی.
٣- کارێکی گرنگتری سەرشانی مێش ئەوەیە کە فەرمانبەرداری بۆ پاککردنەوەی ئەو شتانەی کە مرۆڤ بە چاوی ئاسایی نایانبینێ لە میکرۆبی نەخۆشیی زیانبەخش. کەواتە مێش -بە بۆچوونی مامۆستا- هۆی گواستنەوەی میکرۆبی نەخۆشی نییە، وەک وا باوە. بەڵکو بە پێچەوانەوە، میکرۆبی زیانبەخش لەناو دەبات و بە هەڵمژین و خواردنیان

سەعیدی نوورسی

قەڵاچۆیان دەكات. هەروەک مادە ژەهراوییەکان پاک دەکاتەوە و دەیانگۆڕێ بە مادەی تر و نایەڵێ زۆربەی نەخۆشییەکان پەرە بسێنن و بڵاو ببنەوە. بەڵگەی مامۆستاش بۆ ئەم وتانەی ئەوەیە کە گەلێ زۆرن، چونکە هەر شتێک بەنرخ و گرانبەها بێت، هەوڵی زۆری بۆ دەدرێ. (ئەم پرکێشییەی مامۆستا لەخۆڕا نییە و بە لێکۆڵینەوە و ڕامان لە قورئان و فەرموودەکان ئەم بڕیارانەی داوە، ئەگینا بڕیاری وەها بەرامبەر هەموو زانایان و پزیشکانی سەر زەوی کارێکی ئەوەندە ئاسان نییە هەموو کەسێ بوێرێت بڵاوی بکاتەوە، نەک لەم سالانەشدا، بەڵکو لە چلەکاندا! ئەوەتا لە جێیەکی تردا دەری دەبڕێ کە هەسارە گەڕۆکەکانی دەوری خۆر دوازدە هەسارەن، کە تا ئێستاش (دە)یان نەدۆزراونەتەوە و لەو ساڵانەشدا کە ئەو باسە نووسراوە، کەمتریش بوون.

٤- بۆ مەبەستی پاککردنەوەی سەر زەوی، خوای گەورە بەشێک لە زیندەوەرە دڕندە گۆشتخۆرەکانی دروست کردووە بۆ ئەوەی ڕۆڵی کارمەندی تەندروستی و فەرمانبەرداری پاکوخاوێنی ببینن تا بەوپەڕی لێهاتنەوە کاری سەرشانیان ئەنجام بدەن. هەندێکیان خەریکی پاککردنەوەی دەریاکان دەبن بە خواردنی گۆشتی ملیۆنەها گیانلەبەری ئاوی کە ڕۆژانە دەمرن تا ڕووی دەریا و زەریاکان هەمیشە پاکوخاوێن بێ و دیمەنیشی هەردەم گەش و ڕازاوە بێت. خۆ ئەگەر ئەو فەرمانبەرە گوێڕایەڵانە نەبوونایە، ئەوا دەریاکان یەکپارچە بۆگەنیان دەکرد و وەک ئاوێنە نەدەبریسکانەوە (تەنها یەک ماسی هەزارەها گەرا دادەنێ و هەندێ جاریش یەک ملیۆن گەرا، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێژەیەکی نەگۆڕ هەیە بۆ مردن و لەدایکبوونی ماسییەکان.)
هەندێکیش لەو زیندەوەرە دڕندانە، گیاندار و باڵندەی گۆشتخۆرن کە کاری سەرشانیان ڕاگیرکردنی پاکوخاوێنیی ڕووی وشکایی زەوییە کە دەبێ هەموو ڕۆژێک گۆشتی ملیارەها گیاندار و باڵندەی مردوو بخۆن تا سەر زەوی پاک ببێتەوە و نەبێتە شێوی کەلاکە بۆگەن و ڕزیوەکان و ژیانی تیادا تاڵ نەبێت. ئەو فەرمانبەرانە توانایان هەیە بۆنی ئەو لاکە مردارەوەبووە شاراوە و دوورانە بکەن لە دووریی شەش سەعات ڕێگەوە، ئەمانە بە فەرمانی خوا ئاگادار دەکرێن و وەک (ئۆتۆمبێلی ئاگرکوژێنەوە) هەڵمەت بۆ ئەو شوێنە دەبەن و سەر زەوی لە بۆن و بەرامەی گەنیوی ڕزگار دەکەن.

٥- مامۆستا بە تێگەیشتنێکی قووڵ لەو فەموودەیەی پێغەمبەر (درووودی خوای لەسەر بێت) کە فەموویەتی: لە ڕۆژی قیامەتدا هەموو مافێ دەنرێتەوە مشتی خاوەنەکەی، بە ڕادەیەک، تۆڵەی مەڕی کۆڵ لە مەڕی شاخدار دەسێنرێتەوە. وا تێدەگا کە ڕۆژیی حەڵاڵی دڕندە کێوییە گۆشتخۆرەکان بریتییە لە گۆشتی گیانلەبەرە مردووەکان و گۆشتی زیندوانیان لەسەر حەرامە و لەسەری موحاسەبە و سەرکۆنە دەکرێن. ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە کە ئەو گیانلەبەرانەی ڕۆحەکەیان دەمێنێتەوە، با لاشەکەشیان ڕزابێت، جۆرە پاداشتێکی شیاوی خۆیانیان پێشکەش دەکرێت. ئەم بۆچوونە ناوازەیەی مامۆستا گرییەکی گەورەی دڵانمان دەکاتەوە کە ئەگەر وا نەبێت، مرۆڤ هەست بە ستەمێکی گەورە دەکات کاتێ کە گیانلەبەری ناسکی بێهێزی وەک کەروێشک و ئاسک و وێنەیان دەبنە نێچیری دڕندەیەکی ملهوڕ و موسوڵمان هەست بە ئازار دەکات بە بینینی ئەو دیمەنانە ئەگەر تۆڵەیان نەسێنرێ.

٦- هەروەها ئەو مێروولە لەش بچکۆلە پڕ لە غیرەتە کە هیچ کۆسپێک ناتوانێ تەگەرە بخاتە کاریەوە و ساردی بکاتەوە لە ئیشکردن، خوای گەورە کارێکی خنجیلانەی پێ سپاردووە کە بریتییە لە کۆکردنەوەی پارچەی ورد و پەرشوبڵاوی بەخششە خواییەکان وەک دانەوێڵە و وردەخۆراک تا بەفیڕۆ نەڕۆن و لە ژێر پێیاندا سووک نەبن، لە لایەکی ترەوە کاری کۆکردنەوەی لاکی مێرووە بچکۆلەکانی پێ سپێرراوە تا بۆ خۆراکی زستان هەڵیان بگرێت و وەک کارمەندێکی تەندروستی سەر زەوی پاک بکاتەوە.

٧- دەربارەی پاشەڕۆکی مێش، بە هەموو جۆرەکانیەوە، لە لایەنی تەندروستییەوە شتێکی پیس و زیانبەخش نییە، بەڵکو لەوانەیە ببێتە خۆراکێکی چاک بۆ مێرووی تر. جا ئەمانە وەک کارگەیەکی ئاڵوگۆڕ و پاککەرەوە هەزارەها جۆر خۆراکی وەها دەخۆن کە مایەی پێگەیاندنی

جۆرەها میکرۆب و ژەهرن. دیارە ئەمەش لە دانایەتیی پەروەردگارەوە دوور نییە (وەک دار و درەختەکان بوونەتە کارگەی هەڵمژین و سەرفکردنی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و بەرهەمهێنانی ئۆکسجین تا ڕێژەی هیچ کامیان نەگۆڕێ.)

٨- (مێشەهەنگ)یش یەکێکە لە جۆرەکانی مێش کە بە ئیلهامی خوایی فەرمانی بەسەرا دراوە هەنگوینێکی پاڵفتەی شیرین کە بەلەزەتترین و ناسکترین خۆراکە و مایەی چاکبوونەوەیە لە جۆرەها دەرد و نەخۆشی، بۆ مرۆڤ دروست بکات (وەک قورئانی پیرۆز لە سوورەتی -النحل-دا ئاماژەی بۆ کردووە.)

مێشێک ئەمە کار و فرمانی بێ و ئەمە سەنگ و بەهای بێ لە تەرازووی خوادا، چۆن دەبێ مرۆڤ لە قووڵایی دڵیدا خۆشی نەوێ؟ بۆیە دژایەتیکردنی مێش -جگە لە هەندێکی کەمی زیانبەخشیان کە پێویستە قەڵاچۆ بکرێن تا لە زیانیان دوور بین- کارێکی نەشیاوە و ئەوپەڕی ستەمە بەرامبەر بە گیانلەبەرێکی ناسکی بێتاوان کە مرۆڤ بە کەمیی زانست بڕیاری زیانبەخشێتیی داوە و ڕۆژێ لە ڕۆژان دەگاتە ئەو قەناعەتە کە پێویستە ئەم هەڵە گەورەیە ڕاست بکاتەوە.

٩- هەتا لەوانەیە (کێچ) و (مێشوولە)ش فەرمانبەرێکی گوێڕایەڵ بن بۆ فەرمانی پەروەردگاریان تا خوێنی پیسی ناو دەماری خوێنهێنەرەکانی ئادەمیزاد بگرن، بە وێنەی کەڵەشاخ، بە تایبەتی لە کاتی گەرمادا و لە کاتی زۆریی ڕادەی خوێن لەچاو پێویستیی جەستەدا، تا بەو کارەیان خزمەتێک بە تەندروستیی ئادەمیزاد بکەن.

جا جۆرە مێشێکیان -جگە لە مێشەهەنگ- شتی گەنیوی جۆربەجۆر دەخوات و لەجیاتیی پاشەڕۆکیش بە بەردەوامی جۆرە مادەیەکی شیرینی لێ دادەچۆڕێ - وەک بارینی گەزۆ لە سەر گەڵای درەختەکان. ئەمەش دەیسەلمێنێت کە ئەم جۆرانە بە ڕاستی کارگەی پاککردنەوەی سەر زەوین بە گۆڕینی ئەو کەرەسە پیسانە بۆ بەرهەمی نایاب.

جۆرە مێشێکی زۆر وردیش هەن کە لە شێوەی تۆپەڵێکی ڕەشدا لە کۆتایی بەهاردا لە سەر لقوپۆپی قۆخ و قەیسی کۆ دەبنەوە، لەجیاتیی پاشەڕۆک شیلەیەکیان لێ دادەچۆڕێ کە لە هەنگوین دەچێت و جۆری تری مێش و مێرووی لێ کۆ دەبێتەوە و دەیمژێ، وەک کەتیرەش کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

جۆرێکی تر لە مێش کاری سەرشانیان بریتییە لە پیتاندنی هەندێ گوڵی ڕووەک و درەختە بەردارەکانی چەشنی هەنجیر!

جۆرێکی تریش کە پێی دەوترێ «گوڵەئەستێرە»، لە شەودا بە وێنەی گڵۆپێکی سەوزی بچووک دادەگیرسێ و هەندێکیش وەک زێڕ دەدرەوشێنەوە.

جۆرێکی تری چەکدار لە مێش کە هەڵگری ڕمێکی تیژ و بڕندە و گەزندەن، بریتییە لە مێشوولە و زەردەواڵە و شەنگەسوورە. ئەم جۆرانە خوای خاوەن سۆز و بەزەیی لغاوی کردوون و ماوەیان نادات هێرش بکەنە سەر مرۆڤ و گیانلەبەران، ئەگینا تۆوی مرۆڤیان دەبڕییەوە وەک نەمروودیان کوشت.

بە ڕاستی کە ئەم باسانەم خوێندنەوە، دڵم ئارام بوو بەو فەرموودە شیرینەی پێغەمبەری ئازیزمان کە ئامۆژگاریی موسوڵمانان دەکا «ئەگەر مێش کەوتە ناو دەفری هەر کەسێکیانەوە، با هەڵی بژەنێ پیایا و ئەوسا فڕێی بدا، چونکە مێش لە باڵێکیدا دەرد و لەوی تریدا دەرمان هەیە (بوخاری لە ئەبوهورەیرەوە ڕیوایەتی کردووە.)

**هۆی ڕواڵەتی و هۆی ڕاستەقینە:**

یەکێکی تر لە بۆچوونەکانی مامۆستا ئەوەیە کە هەرچی شتێک لەم دنیایەدا بەسەر مرۆڤدا دێ، دوو هۆی هەیە، یەکەمیان: هۆیەکی دیار و ڕواڵەتی و دووەمیشیان هۆیەکی ڕاستەقینەیە.

چەند نموونەیەکمان بۆ دەهێنێتەوە، یەکێک لەوانە دوورخستنەوەی مامۆستا بوو لە (وان)ەوە بۆ ڕۆژئاوای تورکیا، ناوچەی (بارلا)، کە ئەهلی دنیا

سەعیدی نووری

تاراوگەدا بۆی دەست بدات.

ڕیشنەهێشتنەوە:
لە کتێبی ژیاننامەیدا هاتووە کە دەڵێت: ڕیشهێشتنەوە سوننەتێکی پیرۆزی پێغەمبەرە و بە تەنها تایبەت نییە بە زانایان، منیش هەر لە سەرەتاوە نەمهێشتووەتەوە و لە ناو ژینگە و کۆمەڵگەیەکدا گەورە بووم کە لەسەدا نەوەدیان ڕیش ناهێڵنەوە. دوژمنانیشمان هەمیشە هێرشمان دەکەنە سەر و لە ڕاستیدا ڕیشی هەندێ لە خۆشەویستانی منیان تاشی.
هەتا جارێکیان لە دادگا پرسیاریان لێ کردم کە: بۆچی ڕیش ناهێڵیتەوە؟ وتم: تاکو ئێوە نەیتاشن!
هەندێک زانایان وتوویانە دروست نییە ڕیش بتاشرێت، مەبەستیان لە تاشینیەتی دوای هێشتنەوەی، چونکە تاشینی دوای هێشتنەوەی حەرامە، بەڵام گەر کەسێک هەر لە سەرەتاوە نەیهێشتبێتەوە، ئەوا سوننەتێکی جێبەجێ نەکردووە.
ئیدی لەم چەشنە ڕووداوانەوە لە حیکمەتی ڕیشنەهێشتنەوەم تێگەیشتم و زانیم سەبارەت بە من چاودێرییەکی پەروەردگارە، چونکە ئەگەر من ڕیشم بهێشتایەتەوە و پاشان ئەوان بیانتاشیبایە، ئەوا «پەیامەکانی نوور» زیانێکی گەورەیان پێ دەگەیشت و منیش لە داخ و مەراقدا دەمردم! (وەرگیراو لە کتێبی ژیاننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، وەرگێڕانی: فارووق ڕەسوول یەحیا، چ١، ٢٠١٣ز، لا٨٤١-٨٤٢.)

**وەرنەگرتنی خێر و سەدەقە و دیارییش بەبێ بەرامبەر:**
بە کورتی، گرنگترین هۆکاری وەرنەگرتنی خێر و سەدەقە لە خەڵک وتەکەی (ئیبن حەجەر)ە کە

بوونە هۆیەکی ڕواڵەتی و ڕەهەندەی ئەو شوێنە دوورەیان کرد بەو پێیەی کە گوایە: ئەم پیاوە لەو ناوچەیەدا چالاکیی زانستی و نەتەوایەتیی زۆرە و لەوانەیە بۆ دواڕۆژ مەترسیی هەبێت بۆ دەسەڵات و کورسییان چەندین ئەوەندەی شۆڕشەکەی شێخ سەعیدی پیران بێت. بەم پێیە، ستەمیان لێ کرد و دەربەدەریان کرد.
بەڵام هۆی ڕاستەقینە کە قەدەری پڕ لە داد و عەدالەتی خواییە، شتێکی تر بوو، ئەوە بوو کە ئەو لە ناوچەی خۆیدا نەیدەتوانی ئەو کارە گرنگەی سەرشانی جێبەجێ بکات کە نووسینی (پەیامەکانی نوور) بوو، چونکە ئەو نووسینە پێویستی بە چۆڵی و پەرژان و خواپەرستی و ئازار و تەنیایی و لێبڕان و بیرتیژییەکی وەها هەیە مەگەر لە شوێنێکی وەک بارلا و حاڵێکی وەک

وتوویەتی: (گەر تۆ پیاوچاک نەبیت و شتێکت
بە نیازی پیاوچاکی پێ ببەخشرێ، حەرامە
وەری بگری.)
خۆ ئەگەر خۆم بە پیاوچاکیش بزانم، ئەوا
لەخۆباییبوونە و بەڵگەی ناچاکییە. بۆ کارە
قیامەتییەکانیش، وەرگرتنی سەدەقە و
دیاری، لێکردنەوەی بەرهەمە باقییەکانە و
بەفەنابردنیانە لەم دنیا فانییەدا.

**پرسیارنەکردن لە کەس:**

مامۆستا لە تەمەنی نۆ ساڵییەوە خەونی دیوە
بە پێغەمبەرەوە و لەو خەوەدا داوای زانست
و زانیاریی کردووە، ئەویش فەرموویەتی:
«زانست و زانیاریت پێ دەدرێ بە مەرجێ
پرسیار لە هیچ کەسێکی ئوممەتەکەم
نەکەی!» ئەویش پابەندی ئەو بەڵێنەی بووە
و وتوویەتی: «نکۆڵیم لە زانستی زانایان نییە،
کەواتە پێویست ناکات بۆ تاقیکردنەویان
پرسیاریان ئاراستە بکەم، بەڵام هەر کەسێک
گومانی لە زانستەکەی من هەیە، دەتوانێ
چ پرسیارێکی هەیە بیکات، من وەڵامی
دەدەمەوە.» شاهیدی ئەم باسەشمان
(پیرەمێرد)ی نەمرە کە لە (ڕۆژنامەی
ژین)دا باسی ئەم حاڵەتەی
کردووە و تەنانەت ئەمە بوو بە
هۆی سەرەتای یەکترناسینی
یەکەم جاریان. وا دیارە لە
ئەستەنبوڵ قاوەخانەیەکی
خوێندنەوەی ڕۆژنامەی تایبەت
بە کوردەکان هەبووە بە
ناوی (قیرائەتخانەی دیاربەکر)،
ڕۆژێک پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکاندا
ئەو هەواڵەی بیستووە کە
(مەلا سەعیدی نوورسی) ڕای
گەیاندووە: «ئامادەیە لە ماڵەکەی
خۆیدا وەڵامی هەموو پرسیارێک
بداتەوە.» لەو هەواڵەوە
پیرەمێرد خولیای ناسینی
نوورسی دەکەوێتە سەری
و دەبنە هاورێ و هاوکاری
چەندین ساڵەی یەکتر. ئەوەتا لە لاپەڕە (٢-٣)ی
ژمارە (٦٦١) ی ساڵی ١٩٤٢ی ڕۆژنامەی (ژین)دا
دەنووسێ:
«لەئەستەنبوڵ بووم، ئاموشۆی (قیرائەتخانەی
دیاربەکر)م ئەکرد. زۆرتر کوردەکان لەوێ
دادەنیشتن. ڕۆژێکیان لەغەزەتەدا خوێندمەوەکە:
«لە(وان)ەوەمەلا سەعید ناوێک هاتووەلەقەبی
(بەدیعوززەمانی کوردی)یە، لە(مەدرەسەی فاتیح)
دادەنیشێت. تا حەوت ڕۆژ هەرکەس ئارەزوو بکا
لەعیلمدا هەرچی لێ بپرسێت، جوابی ئەداتەوە.» ئەم
ئیعلانەبوو بەجونبوشێک بەژن و بەپیاوەوەهەرچی
هەڵدەستا ڕووی ئەکردەفاتیح. نیوەیان بۆ پرسیار
و نیوەیان بۆ سەیر، ئەچوون. هێجگار ئەوانەی
کەئەچوون عەجائیبیان لەوەئەما، کوردێکی هەڕەتی
کوڕێنی، بەشاڵ و شەپک، چۆغە و ڕانک و پشتێنێکی
چیت، دوو سێ جامەدانە و شەدەی گوڵنکەدار
بەسەرەوە، قەمەیێک بەلاقەدەوە و سمێڵ بادراو و
ڕیشی هەڵپاچراو، لافی مەلایەتی لێ ئەدا.
ڕەفیقێکم بوو یادی بەخێر، (خەلیل خەیاڵی)
زۆر خوێندەوار و بەویقار و بەئاپار،
هەمیشەبەیەکەوەبووین! پێی گوتم: ئاغا، مەلا
سەعیدی بەدیعوززەمان هاتووە، هێشتا تۆ نەچووی
بیبینی؟ وتم: کاکە، من و مەلایان نەوتووە. وتی:
ئاخر ئەویش وەک تۆ لەمەلایان بێزارە. تەعریفی
وا بۆ کردم دەستبەجێ وتم: هەستەبا بڕۆین. وتی:
باشە، وا ئێوارەیە، درەنگەئێستا کەسی لەدەور
نەمابێ... کەچووین، لەدوور ئێمەی بەچاو کرد.
هەستا هات بەپیرمانەوە، بە(خەیاڵی بەگ)ی گوت:
یاخوا بەخێر بێی. دیارییەکی قنجت بۆ هێناوم.
باوەڕم ئەوەیەئەمە(سلێمانیەلی تۆفیق بەگ)ە! {ناوی
پیرەمێردە}. (خەیاڵی)ش وتی: سەییدی! بەچت
زانی هەوە؟ وتی: دڵم خەبەری دامێ. هەویش
نەبێ، بەو نیەتەدەست ئەکەمەملی. دەستی ڕاستی
بەسەر شانمدا هێنا، خستییەپشت شانمەوە، وتی:
موصافەحەی کوردان وەسانە. دانیشتین. لەپاش
گفتوگۆیەک، بووینەئاشنا.»

**هونەر و سینەما و مۆسیقا لە دیدگای مامۆستا نوورسییەوە:**

وتە دەبێ بەپێی مانا سروشتییەکانی وەسف بکرێ

و شکڵ بەپێی ناوەڕۆک بێت، لە کاتی دروستکردندا ئیزن لە مەزموونەکەی وەربگیرێ، دەبێ بایەخ بدرێ بە شێوازێکی گەش و سەرنجڕاکێش و بە هیچ جۆرێک ئامانج و ڕەمز لە بیر نەکرێ. دەبێت خەیاڵ لە نێو گۆڕەپانێکی فراواندا بێت، بەڵام نابێت ڕاستییەکان تێک بدات.
هەر ئامرازێک کاریگەریی خەم و شەوقێکی قورئانییانەی بەجێ دەهێشت، زیانی نییە... بەڵام ئەگەر کاریگەریی خەم و پەژارەی هەتیوانەی لە مرۆڤدا بەجێ دەهێشت و شەوقی هەوا و ئارەزووی دەروونی لەودا دەورووژاند، ئەوا بەکارهێنانی ئەو ئامرازە بە «حەرام» دادەنرێت. ئەم حاڵەتەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت و هەموو خەڵکی لەم هەست و نەستەدا یەکسان نین.
(وەرگیراو: لە کتێبی بریسکەکان بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی، وەرگێڕانی: فاررووق ڕەسوول یەحیا، چ١، ٢٠٠٦ز، لا-٨٢٧.)

**وازهێنانی لە سیاسەت:**

مامۆستا نوورسی دوای تەمەنێکی زۆر و هەوڵ و کۆششێکی سەرەمڕ و لێبڕانێکی تەواو، بە یارمەتی و کۆمەکی قورئان، گەیشتە ئەو بڕیارە کە لە ڕێی سیاسەتەوە خزمەتی ئیسلام ناکرێت و حوکمی شەریعەت بەو پینەوپەڕۆیە بەرپا ناکرێتەوە. بۆیە پەنای بە خوای گەورە گرت لە شەڕ و خراپەی شەیتان و سیاسەت. ئەوپەڕی سەرسامی ڕووی تێکردم... چونکە تێگەیشتم کە وام لە خزمەت پیاوێکی یەکجار هەڵکەوتوودا... چونکە بە یەقینی گەیشتمە قەناعەت کە ئەم ڕستە ناوازەیەیە وا (بدیع الزمان)ی کردووەتە هەڵکەوتووی سەردەمەکەی و هەر بەم ڕستە ڕەنگینەش پرۆگرام و نەخشەی نوێخوازیی چەرخی تازەی لە خۆ گرتووە. بە بۆنەی ئەم ڕستەوە زۆرێک لە خەڵکی خراپ لە مامۆستا حاڵی دەبن، بە ڕادەیەک، هەندێکیان تاقەتیان نابێت نووسینەکانی بخوێننەوە، کەچی لە ڕاستیدا گەیشتنی بیر و هەستی مامۆستا بە ڕادەیەکی وەها بەرز و تێگەیشتنێکی وەها قووڵ کە لە بەرزترین شێوەدا بانگی ئیسلامیی بڵاو بکرێتەوە، دوور

لە هەڵە و هەرزەکاری، ئەوەیە ئەم ڕستەیەی بۆ هاتووە و وەک دروشمێکی گشتی و ناوازە لە هەموو جیهانی بیر و هەستدا تەنها ئەم پێی گەیشتووە. وەک بڵێی ئەم ڕستەیە (پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتان و لە سیاسەت) کلیلی ڕاستکردنەوەی کاری بانگەوازی ئیسلامییە لەمڕۆ و دواتریشدا.

هۆکارەکانی ئەم وازهێنانەی مامۆستا لە سیاسەت دەیان هۆکارن و لێرەدا بواری ڕوونکردنەوەیانمان نییە و پێشتر لە کتێبێکی سەربەخۆماندا باسمان کردوون.

پرۆفایل:

حەبیب موحەممەد سەعید

لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٨ لە گوندی (بەڵخەی هەورامان).

دەرچووی خانەی مامۆستایانی سلێمانی، ساڵی ١٩٦٩.

لە کۆتایی ساڵانی حەفتاکانەوە دەنووسێت و خاوەنی زیاتر لە سەد نووسراوە.

خەڵاتی (پاڕەزانی بۆ نووسین و وەرگێڕان) وەرگرتووە، ساڵی ٢٠٠٩.

نووسینەکانی زیاتر لە بابەتی سیرە و مێژووی ئیسلامن. وەک: ژیانی پێغەمبەر (ئازیزمان) و خەلیفەکانی و هاوەڵەکانی و هەندێ گەورەپیاوانی ئیسلام.

دەربارەی هزر و کار و بیرەوەری و ژیاننامەی سەعید نوورسی ئەم نووسینانەی هەیە (بە کوردی و بە عەرەبی):

١- ژیاننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی. (١٩٩٢ چ ١)، ٢٠١٠ چ٣. (هەر وەک ئەم کتێبە ساڵی ١٣٨٠ی هەتاوی وەرگێڕراوەتە سەر زمانی فارسی و د. جەلالی جەلالیزادە پێشەکیی بۆ وەرگێڕانە فارسییەکە نووسیوە.)

٢- چەند چەپکێ بیرەوەری سەبارەت بە مامۆستا نوورسی (پیاوان). ١٩٩٤ چ١.

٣- چەند چەپکێ بیرەوەری سەبارەت بە مامۆستا نوورسی (ئافرەتان). ١٩٩٨ چ١. ٢٠١١ چ٢.

٤- لە ڕوانگەی پەیامەکانی نوورەوە:

أ- نزا و پاڕانەوە، بە عەرەبییش: (الدعاء و التضرع في ضوء رسائل النور).

ب- ڕزق و ڕۆزی

ت- وازهێنانی (بديع الزمان) لە سیاسەت، بە عەرەبییش: (لماذا ترک بديع الزمان ميدان السياسة؟ في ضوء رسائل النور.)

٥- ناوازەیی بیری مامۆستا نوورسی (دەستنووس): هەشت ئەڵقە.

٦- گەشتێک بەرەو پەیامەکانی نوور. بە عەرەبییش: (كيف وجدت رسائل النور؟)

٧- کورتەپێناسەیەکی پەیامەکانی نوور. بە عەرەبیش: (من مزايا رسائل النور).

٨- خاوەن ئیمتیازی وەرزەگۆڤاری (سۆز)ە.

٩- خاوەنی (کتێبخانەی سۆز)ە.

# هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی نوورسی

**فاروق ڕەسووڵ یەحیا**

وەرگێڕی بەرهەمەکانی نوورسی بۆ زمانی کوردی (زاری کرمانجیی خواروو)

faruq_r@hotmail.com

**سەرەتا:**

ئایا سەعیدی نوورسی (کوردی) سەرکردەیەکی نەتەوەییە، یان پێشەوای دەستە و کۆمەڵێکی ئایینی؟

ئایا مامۆستای مزگەوتە، یان ڕابەرێکی ڕۆحیی تەریقەتێک و ڕێبازێکی سۆفیزم؟

ئایا کوردایەتی و ئاییندارییی چۆن پێکەوە گرێ داوە؟

ئایا بە کاری سیاسییەوە سەرقاڵ بووە، یان دوورەپەرێز بووە لێی؟

بۆچی دەسەڵاتدارانی سەردەمەکەی وەکو نەیارێکی سیاسی مامەڵەیان لەگەڵ کردووە؟

بۆچی بەسەرهاتەکانی ژیانی و بەرهەمەکانی بە چەندین زمانی جیهان وەردەگێڕرێن و لە گەلێ زانکۆدا توێژینەوە لەسەر بەرهەمەکانی دەکرێت و کۆنفرانسی زانستییان بۆ دەگیرێت؟

ئەم پرسیارانە و چەندان پرسیاری تریش هەن، کە لەو ڕووەوە بەشی زۆری تەمەنی خۆمم لە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی نوورسیدا بۆ زمانی شیرینی کوردی بەسەر بردووە، هەردەم لە لایەن ئاشنایان و خوێنەران و دۆستانمەوە ڕووبەڕوویان بوومەتەوە و دەشبمەوە.

بۆ یەکلاکردنەوەی ئەم باس و بابەتە جۆراوجۆرانە، دەڵێم:

ئەگەر هەریەک لە ئێمە بیەوێت وەڵامێکی تێروتەسەلی ئەم جۆرە پرسیارانە وەربگرێت و بۆ خۆی بە چەشنێکی بابەتییانە بگاتە دەرەنجامەکان، پێویست دەکات لە خاڵی سفرەوە و بەدەر لە بڕیار و بۆچوونی

پێشوەخت، خوێندنەوەی لەسەرخۆ و پشوودرێژ و هەڵسەنگاندنی زانستییانە بۆ بەسەرهاتەکانی ژیانی نوورسی و سەرجەمی بەرهەمەکانی بکات، تاکو هەموو یەکێکمان بتوانین دوور لە کاریگەریی دەرەوەی خۆمان، بگەینە وەڵامی سەرجەمی ئەو پرسیارانەی کە لامان گەڵاڵە دەبن و لە بیرماندا جۆش دەخۆن.

خۆ هەرچەندە دڵنیام لەوەی کە بەشێک لە خوێنەرانی بەڕێز هەم ئەو توانایە لە خۆیاندا شک دەبەن و هەم کاتی ئەوەشیان بە دەستەوە هەیە کە ئەو ماندووبوونە بەتاموچێژەی توێژینەوە و بەدواداچوون لەسەر کەسایەتییەکی گەورە و مایەی شانازیی گەلی کورد بخەنە ئەستۆ، تاکو ئێمەش بە وێنەی توێژەرانی گەلانی تر وێنامان بۆ نوورسی و هەڵسەنگاندنمان بۆ ژیان و بەرهەمەکانی لەسەر بناغەی کاری ئەکادیمی و زانستییانەی جیاواز لە هەست و سۆزی دەروونی دابمەزرێنین. لەگەڵ ئەمەدا، ئەو ڕاستییەش دەزانم کە هەموو خوێنەرێکی ئازیزی زمانە خۆشەویستەکەم ئەو دەرفەتەی بۆ نایەتە پێش کە بۆ خۆی ئەو جۆرە تاووتوێکردنە بکات و بگاتە ئەو دەرەنجامانەی کە بەڵگەکان بە دەستیەوە دەدەن.

بۆیە هەوڵ دەدەین لەم چەند لاپەڕەیەدا بە خێرایی و ئاماژەپێدان و لە ڕێی ناساندنی هەندێ لە تایبەتمەندییەکانی نوورسییەوە زەمینە بۆ وەڵامی هەندێ لەو پرسیارانە خۆش بکەین. ئەمەش وەک ڕچەشکاندنێک بۆ خوێنەری خۆشەویست، بەڵکو ئەگەر ئێستاش بواری لە بەردەمدا نەبێت، لە داهاتوودا بتوانێت بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی نوورسی و ژیاننامەکەی پتر لەم کەسایەتییە نزیک ببێتەوە و پێی ئاشنا ببێت و بە تەقەلای خۆی وەڵامی گەلێ پرسیاری وەک ئەمانە بە دەست بهێنێت. چونکە مافدانی تەواوەتی بە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە مەودایەکی بەرفراوانی دەوێت کە مەگەر بە نووسینی کتێبێک، دەنا لە کێشی وتارێکی چەند لاپەڕەییدا نییە.

**کلیلێک بۆ تێگەیشتن لە تایبەتمەندییەکانی نوورسی:**

توێژەرانی بەسەرهات و ئاسەوارەکانی کەسایەتییە گەورەکان، زۆربەی جار، لەسەر ڕەوتێکی باو یان چەند پێوەرێکی کلاسیکیی دووپاتبوو یاخود جۆرە پۆلێنکردنێکی چەقبەستوو ڕاهاتوون کاتێ بە مەبەستی تێگەیشتن لە ژیان و بەرهەم و تایبەتمەندییەکان دەڕۆنە ناو جیهانی ئەو کەسایەتییانەوە. هەندێ جاریش سۆراخی ئەو ڕەهەند و خاڵە هاوشێوانە دەکەن کە ئەو کەسە جیاوازانە لە چەند ڕوویەکەوە و لە سەر زەوییەکی هاوبەش کۆ دەکەنەوە.

بەڵام لەبەر ئەوەی بەدیعوززەمانی نوورسی، چ لە وێستگەکانی ژیانی و چ لە کردار و گوفتارەکانیدا، کۆپی و دووپاتبووی خەڵکانی پێش خۆی نەبووە و جێدەستی جیای لەسەر ڕووداوەکان بەجێ هێشتووە، ئەوا بە بەراورد لەگەڵ کەسەکان و باری کۆمەڵایەتیی قۆناغەکەیدا، بازی بەسەر ئەو پێوەرە کلاسیکییانەدا داوە و شەقڵی تایبەت بە خۆیی لە هەموو یەکێکی ئەو هەڵوێستانەدا نەخشاندووە. هەر لەبەر ئەوەیە کە پۆلێنکردنی کەسێکی وەکو نوورسی لە یەکێکی ئەو خانە باوانەدا هەرگیز ڕێخۆشکەر نابێت بۆ تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست لە ژیان و بەرهەمەکانی.

بۆیە پێویست دەکات -وەک پێشتر وتمان- بەدەر لە بڕیار و بۆچوونی پێشوەخت، بڕۆینە ناو جیهانی نوورسی و خاڵە تایبەتەکانی سۆراخ بکەین.

وا بە پشتیوانیی خوای گەورە هەوڵ دەدەین، زۆر بە کورتی، هەندێ لەو تایبەتمەندییانە لەم بڕگانەی خوارەوەدا بخەینە ڕوو:

**بنەماڵەی نوورسی:**

هەرچەند نوورسی بۆ خۆی لە هەندێ نووسینیدا لە ڕووی تەوازوعەوە دەڵێت: «لە بنەماڵەیەکی ناسراو نیم»، کە پتر مەبەستی ئەوەیە لە ئاستی وڵات و کوردستاندا وەک بنەماڵەیەکی دەستڕۆیشتووی

خێڵەکی یان سیاسیی خاوەن ناوبانگی پێشتر نییە، بەڵام خانەوادەکەی، لە ناوچەکەیان و لە گوندەکەی خۆیاندا، بە بنەماڵەیەکی زانستخواز و دیندار ناسرابوون و دایک و باوکی لەڕادەبەدەر پابەندی ئایین بوون، خوشک وبراکانیشی هەموویان خوێندەوار بوون و هەر سێ براکەی و یەکێکیش لە خوشکەکانی لە ڕیزی زانایاندا پۆلێن کراون.

**زیرەکیی سەرنجڕاکێشی نوورسی:**

سەعیدی نوورسی هێشتا مناڵ بووە پرسیاری ورد و زیرەکانەی لەبارەی چەند ڕواڵەت و ڕووداوێکی دەوروبەریەوە کردووە کە منالانی هاوتەمەنی ئەو نەیانئاوزاوە بیریشی لێ بکەنەوە! ئەمەش ئاماژەیەک بووە بۆ کەسوکاری کە ئەم منالە زیرەکییەکی ناوازەی هەیە، بۆیە مەلا عەبدوڵلای براگەورەی بە گەرموگوڕییەوە بایەخی پێ داوە و فێری سەرەتاکانی خوێندەواریی کردووە.

**پرۆسەی نائاسایی خوێندنی و وەرگرتنی بڕوانامەی زانایی:**

ئاشکرایە شێوازی خوێندنی ناو خوێندنگە کانی ئەوکاتەی کوردستان کە لە حوجرەی مزگەوتەکاندا بەڕێوە چووە، ماوەی چەند ساڵێکی تەمەنی خوێندکاری گرتووە و کتێب لە دوای کتێب و زانست لە دوای زانست وانەکانی خوێندووە، هەتا لە کۆتاییدا مامۆستاکانی بڕوانامەیەکیان پێ بەخشیوە کە لە ئاستی تێگەیشتن و ڕادەی وەرگرتنی زانستەکانەوە بووبێت لە لایەن ئەو خوێندکارەوە. باڵاترینی ئەو بڕوانامانەش بڕوانامەی «زانایی» بووە.

مامۆستا بەدیعوززەمانی نوورسی، لەبەر توانای تێگەیشتنی لەڕادەبەدەری، نەهاتووە بە وێنەی قوتابیانی تری ئەو خوێندنگەیانە، وانەی دێربەدێڕ و لاپەڕەبەلاپەڕەی کتێبەکان لای مامۆستاکانی بخوێنێت. بەڵکو بە ڕێبازێکی جیاواز لەوەی حوجرەکان درێژەی بە خوێندنی داوە، چونکە هەر کتێبێک کە مەبەستی بووبێت لە ناوەڕۆکەکەی تێبگات، لە پێشدا بۆ خۆی موتالای کردووە و لە زۆربەیان تێگەیشتووە، ئینجا ئەو باسە کەمانەش کە تێگەیشتنیان ئاسان نەبووبێت، لەبارەیانەوە پرسیاری لە مامۆستاکانی کردووە و ئەوانیش وەڵامیان داوەتەوە. هەر بۆیە لە ماوەیەکی پێوانەیی کەمدا بووەتە زانای شارەزا و وردەکار لە سەرجەم ئەو کتێب و زانستانەی کە لە حوجرەکاندا خوێنراون. هەتا دەرەنجام لە تەمەنی چواردە ساڵیدا «بڕوانامەی زانایی» بە دەست دەهێنێت کە تەمەنێکە بە بەراورد لەگەڵ قۆناغەکانی ئەمڕۆی خوێندندا تەمەنی خوێندکارێکی دووەم ساڵی قۆناغی ناوەندییە!

**نازناوی بەدیعوززەمان:**

جیاوازییەکی دیکەی نوورسی لەوەدایە کە تەنها بەو زانستانە قایل نەبووە کە لە خوێندنگە ئایینییەکاندا بڕوانامەی بەرزی تێدا وەرگرتوون، بەڵکو بەدەستهێنانی شارەزاییش لە زانستەکانی سەردەمدا بووە بە خولیای. هەر ئەمەش بووە کە هانی داوە لە ماوەیەکی کەمدا و بە ڕەنج و تەقەلای خۆی هێندە زانیاری لەو زانستانەدا بە دەست بهێنێت کە بتوانێت وانەکانیان بڵێتەوە و لەگەڵ پسپۆڕانیاندا بە شارەزاییەوە گفتوگۆ بکات، تەنانەت هەندێ جار بە سەرکەوتوویی لە مونازەرەشدا لەگەڵیان بەشدار بێت.

ئەم توانا جیاوازەی نوورسی هۆکارێکی سەرەکی بووە کە مامۆستاکانی لە باکووری کوردستاندا نازناوی «بەدیعوززەمان»ی بۆ دابنێن و لە زیرەکیدا بیچوێنن بە «بەدیعوززەمانی هەمەدانی»ی گەورەئەدیبی سەدەی چوارەمی کۆچی.

**بیری چارەسەر بۆ دەردە کۆمەڵایەتییەکان:**

لە هەرەتی لاویدا، کە هاوتەمەنانی ئەو لە بیری پێکهێنانی ماڵ و گوزەران و لە خەمی بونیادنانی خێزان و داهاتووی خۆیاندا بوون، نوورسی لە خەمی دواکەوتوویی باری کۆمەڵایەتیی هەموو کوردستان و سەرگەرمی شیکردنەوەی دیاردەکان و لە هەوڵی دیاریکردنی هۆکارە سەرەکییەکاندا بووە و بۆ ڕێگەچارەکان گەڕاوە.

«کاتێک چاوی بەسەر دەوروبەردا کراوەتەوە، دوای شەنوکەوکردنی باری کۆمەڵایەتی و سیاسیی کوردستان، بەو سەلیقە وردبینەی خۆی دەردە

کۆمەڵایەتییەکانی نەتەوەی کوردی لە سێ خاڵدا دەستنیشان کرد:

١- هەژاری.

٢- نەزانی و نەخوێندەواری.

٣- دوژمنایەتیی ناوخۆیی و لەیەکحاڵینەبوون.

بۆیە بڕیاری دا هێندەی پێی بکرێ، هەوڵ بدات بۆ چارەسەرکردنی ئەو دەردە کوشندانە.

نوورسی پێی وابوو ئەگەر کێشەی (نەزانی) چارەسەر بکرێ، ڕێ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دیکە خۆش دەبێ. لەبەر ئەوە، یەکەم جار تێکۆشا بۆ دامەزراندنی (قوتابخانە و زانکۆ) لە شارە گەورەکانی کوردستان. وەک نموونەیەکیش، قوتابخانەیەکی بە ناوی (خورڕخورڕ)ەوە لە شاری (وان) دامەزراند، هەردوو جۆری زانستەکانی ئایینی و گەردوونیی تێدا پێکەوە و بە سەرپەرشتیی خۆی دەخوێنرا.»١

لەپێناوی هەوڵدانیشی بۆ دامەزراندنی زانکۆ لە کوردستاندا، دووچاری هێندە کێشە و گرفت بووەوە کە مەگەر گەورەمەردانی هیممەتبەرز بتوانن ڕووبەڕوویان بوەستنەوە و کۆڵ لە داواکەشیان نەدەن.

لێدوان لەو هەوڵانەی نوورسی باسێکی تێروتەسەلی سەربەخۆ دەخوازێ کە لێرەدا مەودای ئەوەمان بە دەستەوە نییە، خوازیارم خوێنەری بەڕێز لە هەردوو کتێبی «ژیاننامە» کە نووسینی نوورسی و قوتابیانیەتی و لە کتێبی (داوەرییەکان)یشدا بە درێژی زانیاری لەو بارەیەوە بە دەست بهێنێت.٢

**نوورسیی «زانا» و «وەلی»:**

وەک پێشتر زانیمان، نوورسی بە ڕێگە ئاساییەکانی خوێندن زانستەکانی بە دەست نەهێنا، بەڵکو خەڵاتێکی تایبەتیی خوایی بوو کە بە ڕێیەکی جیاواز لە هیی خەڵک پێی

بەخشی، یاخود بە زاراوەی قورئان چەند زانستێکی «لەدوننی» بوون.

بڕینی پلەکانی «تەقوا» و «ئیحسان»یش، یان بە زاراوەی ئەهلی ویلایەت، بڕینی پلەکانی «سەیر و سلوک» لە لایەن نوورسییەوە، بە هەمان جۆر ئەویش جیاواز بووە و بۆ گەیشتنی بەو ئاستانەی تەقوا و ئیحسان، بە ڕێگە زانراوەکانی تەریقەتدا هەنگاوی نەناوە، بەڵکو خوای گەورە بە سۆزی تایبەتیی خۆی ڕێیەکی قەدبڕی لە قورئانەوە پیشان داوە کە لە ماوەیەکی کەمدا بڕیویەتی و لە کۆتاییدا گەیشتووە بەو ئاکامانەی کە ڕێڕەوانی سەیر و سلوک بە ماوەی درێژخایەن و ماندووبوونی زۆر و لەژێر چاودێریی ڕابەرێکدا پێی دەگەن.

**بەدیعوززەمانی سەرکردە:**

تایبەتمەندییەکی تری نوورسی لەوەدایە کە جگە لە بایەخدانی بە بڵاوکردنەوەی زانستە جۆراوجۆرەکان، گیانێکی سەربازییشی لە خۆیدا هەڵگرتووە و قوتابیانی خۆی لە قوتابخانەی خورڕخورڕدا، شانبەشانی خوێندنی وانە ئایینی و زانستییە تازەکان، لەسەر مەشقی سەربازی و ئەسپسواری و

نیشانەپێکان و گوێڕایەڵیی فەرمان ڕاهێناوە، چونکە ئەو دەمە پێشبینی دەکرا کە جەنگ بکەوێتە ناوچەکەیانەوە، بۆیە بە پێویستی زانیوە چی لە توانادایە بۆ ئامادەباشیی بەرگریلەخۆکردن لە هەلومەرجی لەو جۆرەدا، دریغیی لێ نەکەن و بە دەستی بهێنن.

ئەوە بوو پێشبینییەکان هاتنە دی و یەکێک لە بەرەکانی یەکەمین جەنگی جیهانی کەوتە باکووری کوردستانەوە. ئیتر مامۆستا نوورسی هێزێکی جەنگاوەری لە قوتابیانی خۆی و خۆبەخشانی تر پێک هێنا بۆ بەرگریکردن لە شارەکانی «وان» و «بەدلیس». لە لایەن سەرکردایەتیی سوپای عوسمانیشەوە کرا بە سەرکردەی ئەو هێزە خۆبەخشە.

هەرچەندە سەرچاوەکان باس لە ئازایەتیی ئەو هێزە و تاکتیکە سەربازییە سەرکەوتووەکانی و ئەو جەنگانەش دەکەن کە بە شایستەیی تیایاندا بەشدار بووە، کە هەموو یەکێکی ئەمانەش لە تایبەتمەندییەکانی بەدیعوززەمانن، بەڵام لەبەر ئەوەی هێزی سوپای ڕووس و چەکدارەکانی هاوکاری، لە ڕووی جۆر و چەندایەتیی چەک و ژمارەی سەربازەوە، چەندین هێندەی سوپای عوسمانی و هێزە خۆبەخشەکان بووە، ئەوا لە ئەنجامدا هەردوو شاری وان و بەدلیس دەکەونە ژێر دەستی ڕووسەکان و نوورسی لەمەی دووەمیاندا بە دیل دەگیرێت.

قارەمانێتییەکانی نوورسی لە هەڵوێست و ڕووداوەکانی ماوەی دیلیدا و دواتر لە دەمی هەڵهاتنی لەو دیلییە لە ڕێی وارشۆ، ڤیەننا، ئەڵمانیاوە، یەکێکە لە داستانە لەئەفسانەچووەکان و تایبەتمەندییەکی تری نوورسییە کە بە وێنەی نەخشی سەر بەرد لە سەر لاپەڕەکانی مێژووی ژیانیدا بەجێی هێشتووە.

**بوێری لە دادگاکان و لە بەردەم سەرکردە بەزەبرەکاندا:**

هەمووومان دەزانین و ڕۆژانە لە کەناڵەکانەوە نموونەکان دەبینین کە یەکێک لە چارەشوومییەکانی مرۆڤی ئەم سەدانەی دوایی، خۆسەپاندنی فێڵبازانەی دەسەڵاتدارانێکی بەزەبر و بێبەزەیی بووە و هەیە بەسەر موقەددەراتی میللەتاندا، لەژێر گەلێ ناوی خەڵەتێنەری ئایینی یان نەتەوەیی یان شارستانی یان دیموکراسیدا کە لە ڕاستی و ناوەڕۆکدا داماڵینی مرۆڤ بووە لە کەرامەت و بەها مرۆڤایەتییەکانی، پێش ئەوەی داماڵینی بووبێت لە مافی ژیان و بڕیار و لە خاک و ماڵ و سامانەکانی.

بەرەنگاربوونەوەی کەسان و میللەتانیش بۆ ستەمکاران و داگیرکەران، بەپێی کات و شوێن و هەلومەرجەکان، چەندین هەڵکشان و داکشانی بەخۆوە بینیوە و لەم ڕووەوە بیرەوەرییەکانی مێژوو گەلێ ڕووداوی جۆراوجۆر و داستانی قارەمانانەی، لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا و باکوور و باشووری گۆی زەویدا، بۆ تۆمار کردووین.

لەم ڕووەوە، بەدیعوززەمانیش هەر تەنها بۆ خۆی هێندەی نەتەوەیەکە و خەرمانێکی ئەوتۆی لەو قارەمانێتییە لە سەر لاپەڕەکانی ژیانی مەڵۆ کردووە کە وەک چۆن شانازییە بۆ خۆی و گەلەکەی، سەرمەشقێکی مەردانەشە بۆ ئەو کەسە ئازا و بوێرانەی کە شایستەیی ئەوەیان تێدایە لە هەڵوێستە هاوشێوەکاندا بەو ڕچەیەدا شوێنپێی

هەڵبگرن.
یەکەم نموونەی ئەمە لە ژیانی نوورسیدا، بەگژاچوونەوەی ستەمکارییەکانی «مستەفا پاشا»ی سەرۆکهۆزی میران بووە لە ناوچەی جزیرەدا، ئەو پاشا توندوتیژەی کە هیچ کەسێک نەیوێراوە قسە لە قسەیدا بکات و بۆ ناوچاوانیشی بڕوانێت، کەچی نوورسیی لاوی بێپشتوپەنای جگە لە خوای گەورە، بە زبرییەکی هەڕەشەئامێز لەگەڵی دواوە و داوای لێ کردووە دەست لە ستەمکارییەکانی لەسەر میللەت هەڵبگرێت و پەیوەندییەکانیشی لە نێوان خۆی و خوای گەورەدا نۆژەن بکاتەوە. خۆ هەرچەندە ئەم پاشایە چەند نەخشەیەکی بۆ تۆڵەسەندنەوە لە نوورسی دارشت، بەڵام بە ڕواڵەت ڕقی خۆی خواردەوە و بەڵێنی بە نوورسی دا گۆڕانکاری لە خۆی و سیاسەتیدا بکات، خوای گەورەش لە نیازە بەدەکانی ئەو ستەمکارە پاراستی.
دواتر وەڵامەکانی نوورسی لە دادگا ترسناکە زۆر و زەبەندەکاندا، چ لە دەمی دەسەڵاتی ئیتیحادییەکان و دادگای سەربازییاندا، چ لە کاتی دەسەڵاتی کەمالیستەکاندا، کە هەندێ جار لەبەر نەترساوی و ڕاشکاویی قسەکانی تۆمەتی شێتیی دراوەتە پاڵ... هەروەها وەڵامی جەرگبڕ و بوێرانەی کە ڕاستەوخۆ و ڕووبەڕوو لە دەمی دیلیدا ئاراستەی سەرکردەی گشتیی بەرەی جەنگی سوپای ڕووسیای کردووە و پاشتریش وەڵامی توندوتیژی لە ئەنقەرە و لە دیوانی سەرۆکایەتی لە ڕووی مستەفا کەمالدا... هەروەها گەلێ نموونەی تری هەڵوێستە زۆرەکانی دیکەی ژیانی... لوتکەی بوێری و ئازایەتیی کەموێنەی ئەو دەردەخەن.

سەعیدی نووری

**گەلە موسوڵمانەکان ئایین و نەتەوایەتییان یەکێکە:**

لەو کاتەدا کە وەک «کاریگەری»ی فەرهەنگی بیانی لەسەر توێژە خوێندەوارەکان، یان «کاردانەوە»یان بەرامبەری، لە جڤاتە کۆمەڵایەتییەکان و نووسینە پەیوەندیدارەکاندا، بە جیا باس لە پەرۆشیی «ئایینی» و «نەتەوەیی» دەکرا، مامۆستا سەعیدی نوورسی لێکدانەوەی جیاوازی بۆ بابەتەکە دەخستە ڕوو، کە دوای سەرنج و لێکدانەوەی تایبەت بە خۆی پێی گەیشتبوو.
نوورسی لە پێشدا پەرۆشیی «نەتەوەیی» دەکاتە دوو بەشی جیاواز لە یەکتر: ئەرێنی و نەرێنی...
مەبەستی لە نەرێنییەکەیان، ئەو دەمارگیرییە بێبەزەییانەی هەندێ نەتەوەیە کە بە هەڵلووشینی نەتەوەکانی تر و بە دەستدرێژی بۆ سەر خاک و ماڵ و سامانیان، گەشە بە بوونی خۆیان دەدەن و دەسەڵاتی خۆیان زاڵ دەکەن. جا هەر وەک گەلی ئێمە بوو بە قوربانیی ئەم نەتەوەپەرستییەی هەندێ لە گەلانی تر و بەرژەوەندییان، چەندین ڕووداوی دیکەی سەدەی ڕابوردووش نموونەی زۆری ئەم جۆرە نەرێنییەی بیری نەتەوایەتییان لە پێشچاوی جیهاندا خستە ڕوو. ئەم بەشەی بیری نەتەوەیی، لە فەرهەنگی سیاسیی مرۆڤەکاندا زاراوەی «شۆڤێنی» و لە ئایینی ئیسلامیشدا ناوی «دەمارگیریی جاهیلییەت»ی بۆ دانراوە.
ئەرێنییەکەشیان، بە لای نوورسییەوە، هەموو ئەو خزمەتە سوودبەخشانە دەگرێتەوە کە ڕۆڵەکانی هەر میللەتێک پێشکەش بە گەل و نیشتمانی خۆیانی دەکەن بۆ پێشخستنی شارستانییەتەکەی لە سەرجەم بوارەکانی ژیانی ئەو نەتەوەیەدا و داکۆکیکردنی بەسەلیقە و ژیرانەیە لە هەموو مافێکی ڕەوای، بەبێ سەرکێشانی هیچ کام لەم کارە ئەرێنییانە بۆ سووکایەتینواندن بە نەتەوەکانی دیکە یان دەستدرێژی بۆ سەر مافەکانیان.
خۆ هەر ئەم خزمەتە ئەرێنییانەن کە ئایینی «ئیسلام» داوا لە مرۆڤەکان دەکات پێشکەشی گەل و نیشتمانی خۆیانی بکەن. کەواتە لە «ئیسلام»دا نەتەوایەتیی ئەرێنی تەواوکەری ئاییندارییە، یاخود بەشێکی دانەبڕاویەتی.
دروستیی ئەم لێکدانەوە مەیدانییەی نوورسییش بۆ بیری نەتەوەیی، کە دوور لە «کاردانەوە» و «کاریگەری»ی فەرهەنگی بیانییە لەسەری، بە

ڕوونی لە ژیانی کەسایەتییەکان و ڕووداوەکانی مێژووی نوێی میللەتەکەماندا بەرجەستەیە.
فەرمـوو لـە کەسایەتییەکاندا مەولانا خالید و ڕابەرە مەزنەکانی دیکە و لە ڕووداوەکانیشدا ئەو ڕاپەڕینانەی کە لە سەدەی نۆزدەیەمەوە تا شەستەکانی سەدەی بیستەم بۆ لابردنی ستەم لەسەر گەلی کورد و داکۆکیکردن لە مافەکانی سەریان هەڵدا، نموونەی کردەیین کە پشتی ئەم لێکدانەوەیەی نوورسی دەگرن. دەبینی ئەم پەرۆشییە ئەرێنییەی هەڵقوڵاوی موسوڵمانێتی، بزوێنەر و ئاراستەکەر و ڕاگر و گیانی زیندووی هەموو یەکێکی ئەوانە بووە!

**نزیکی و دووریی نوورسی لە کاری سیاسییەوە:**
لای شارەزایانی جیهانی فراوانی بەدیعوززەمان زۆر ئاشکرایە کە ئەو سیاسەتەی، بەبێ گوێدانە هەق و ناهەق، لە خولگەی بەرژەوەندییەکاندا دەخولێتەوە، هەرگیز دەستی بە چمکی جوبەی نوورسی نەگەیشتووە، چ جای ئەوەی ڕۆژێ لە ڕۆژان پێگەیەکی لە ژیانی ئەودا بۆ خۆی گرتبێت. هەروەها ئەو چەشنە سیاسەتەش کە پیرۆزییەکانی ئایین و ئامانجە بڵندەکانی نەتەوە و بەها بالاکانی مرۆڤایەتی، لەژێر هەر ناوێکدا، بەکار بهێنێت بۆ دەسکەوتی کەسی و گرتنی جێگەیەک لە پلەوپایەکانی دنیادا، هەرگیزاوهەرگیز، چ لە دوور و چ لە نزیکەوە، بە لای سێبەری نوورسیدا نەڕۆیشتووە.
بەدیعوززەمان هەر زوو تێبینیی کردووە کە زۆرێک لەوانەی بە گرتنەبەری ئەو جۆرە سیاسەتە هەوڵی بەدەستهێنانی پلەوپایەکان دەدەن، چۆن لە دەرەنجامدا دەبنە ئامراز و لە پێشچاوی گەورەکاندا بچووک دەبنەوە و کاریگەریی وتەکانیشیان لە دڵ و دەروونی جەماوەردا بەرەو نەمان دەڕوات و بەری ڕەنجیشیان دەبێتە تۆزی بابردوو!
خۆ ئەگەر کەسانێک هەبووبن لەو ڕێیەوە ڕەنجی فەرهادیان بۆ بەدەستهێنانی یەکێک لەو خواستانە دابێت، نوورسی بەبێ هەوڵ و داواکاری، گەلێ پلە و پۆستی بڵندی لەو جۆرەی خرایە بەردەست و پێگەی گەورە و سامانی زۆریشی بۆ پێشنیاز کرا، چ لە کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی و چ لە لایەن خودی مستەفا کەمالەوە، بەڵام بە نەویستنی هەموو ئەوانە و هەڵبژاردنی بێنیازی لێیان، بەرزیی خۆی بەسەر هەموو دەسکەوتە فانییەکاندا ڕاگەیاند و لەم ڕێیەوە نەمریی بە دەست هێنا.
بەڵام ئەو سیاسەتەی کە نوورسی بۆ ماوەی دە ساڵی سەرەتای تەمەنی خۆی کاری تێدا کردووە و دواتریش وازی لێ هێناوە، «بەکارهێنانی سیاسەت» بووە لەپێناوی «خزمەت بە ئامانجە بڵندەکانی کۆمەڵ»دا، نەک بە پێچەوانەوە.
ئەوە بوو چاوی بە دەسەڵاتداران دەکەوت و نووسینی لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەکردەوە و چالاکیی جۆراوجۆری دەنواند... لە هەموو ئەوانەشدا داواکارییەکانی خۆی بۆ پێشخستنی وڵات بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی بۆ ڕوون دەکردنەوە. بەو ئومێدەی کە پەرۆشی و دڵسۆزییان ببزوێنێت و دەسەڵاتیان بخاتە کار بۆ ئەوەی هەرچی زووە فریای میللەت و وڵات بکەون، تاکو چیی تر لە کاروانی ڕانەوەستاوی شارستانییەتی ڕۆژگار جێ نەمێنن، تەنانەت هێندە بە گورجوگۆڵی لێ ببڕێن کە بکەونە ڕیزی پێشەوەی ڕێڕەوانی ئەو کاروانە.
ئەمە نیازی نوورسی بوو لەو تێکۆشانەیدا. کەچی مخابن، کورد واتەنی: «ئاش لە خەیاڵێک و ئاشەوان لە خەیاڵێ!» چونکە پێشنیازەکانی نوورسی بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە بڵندانەی میللەت جێی شایانی خۆیان لە بەرنامەی کاری زۆرینەی ئەو کاربەدەستانەدا نەگرت کە مەگەر دوای گرنگیدان بە خواستەکانی خۆیان، بیریان لە خێروخۆشیی میللەت و وڵات کردبێتەوە.
پەندوەرگرتنی نوورسی لەم چەشنە کاردانەوەیەی دەسەڵات، هۆکارێکە بۆ دوورکەوتنەوەی تەنانەت لەم جۆرە سیاسەتەش کە هیچ دەسکەوتێکی تایبەتیی تێدا نەبووە و تەنها بۆ پێشخستنی وڵات بەکاری هێناوە.
هۆکارێکی دیکەی دوورکەوتنەوەی نوورسی لەو جۆرە سیاسەتە و لە سەرجەم چالاکییەکانی پێشووی، ئاڵوگۆڕە سەیروسەمەرە و گەورە و خێرا و بوومەلەرزەئاساکەی ئەو چەند ساڵە کەمەی دوای یەکەم جەنگی جیهانی بوو کە چ لە تورکیا و چ لە ناوچەکە و چ لە جیهاندا ڕایەخی بایەخە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی میللەتانی

تەکاند و بەها مرۆڤایەتییەکانی لەرزاند و ئامانجە بڵند و جێگیرەکانی لە شوێنی خۆیاندا لەقاند و شەنوکەوی هەموویانی کرد و هیچ شتێکی لە جێی خۆیدا وەک خۆی نەهێشتەوە. ئینجا داروپەردووی ئەو ئاڵوگۆڕانەشی -بەبێ ویستی گەلان- بە نەخشەیەکی نوێ و بیر و دیدێکی تر و ئاڕاستەیەکی دیکەی تەواو جیاوازی فەرهەنگی و فەلسەفی و سیاسی و کۆمەڵایەتی داڕشتەوە!

نوورسی دوای تێڕامانی لەم دیاردە گەورە و گرنگ و خێرایەی جیهان و لێکدانەوەی وردی بۆ دەرهاویشتەکانی، بە دڵنیاییەوە تێگەیشت لەوەی کە چیتر دوژمنانی بەرەی بەرامبەری تەنها «نەزانی و هەژاری و دوژمنایەتیی ناوخۆ»ی گەلەکەی نین کە تا ئێستا سەنگەری خەباتی لە دژ گرتبوون؛ بەڵکو دوای هەستکردنی بە پەنجە پەنهانەکانی پشتی ئەو ڕووداوانەی کە تیریان گرتە پایەی بڵندی مرۆڤایەتی و ناخی کەرامەتی مرۆڤیان پێکا و سەردەمێکی نوێی کۆیلایەتییان بۆ ئادەمیزاد لە پۆشاکێکی تازەدا هێنایە کایەوە... دوای پەیبردنی بەمانە، لای ڕوون بووەوە کە بەرەی نوێی جەنگ لە ڕووبەرێکی یەکجار فراوانی هێندەی جیهاندایە و دوژمنانی ناو سەنگەری بەرامبەریش بە هەموو چەک و هۆکارێکی نوێی هاوچەرخ لە دژی گشت بەها بڵندەکانی نەک تەنها گەلی کورد، بەڵکو سەرجەمی مرۆڤایەتی وەستاونەتەوە.

سەعیدی نوورسی

ئینجا شۆکی ئەو نسکۆیەش هێندە پەشۆکاویی لە ناوەندە پەیوەندیدارەکاندا نایەوە کە تەنانەت دڵسۆزانیش واقیان وڕ ما و لە دۆزینەوەی ڕێی بێوەیدا دۆش دامان.

بەدیعوززەمان لەم دۆخ و هەلومەرجەدا، بە هۆی زیرەکیی لەڕادەبەدەری و بوونی لە ناوجەرگەی ڕووداوەکاندا، هاوکات لەگەڵ ئەو جوامێری و ورەبڵندییەی کە هەڵوێستەکانی ژیانی کردبوویان بە پێناسی کەسایەتیی ئەو لای جەماوەر، بڕیاری دا -گەر بە تەنیا خۆیشی بووە- سەنگەر بەجێ نەهێڵێت و داکۆکی لە گیان و گەوهەری بەرزی سەرانسەری مرۆڤایەتی بکات. جا هەر وەک لە قۆناغی پێشووی ژیانیدا، بە سەلیقە وردەکەی، گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە چارەسەری کێشەی «نەزانی» دەرگا دەخاتە سەر پشت بۆ چارەسەرکردنی دەردە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی کوردەواری، لەم کێشە نوێیەشدا پەنجەی خستە سەر ئەو خاڵە مەترسیدارەی کە ئەگەر پشتگوێ بخرێت، دارمانی تەواوەتیی ڕۆحی و ڕەوشتی گشت ناوەندەکان دەگرێتەوە و چەکیش دادەنرێت بۆ وێرانکاران کە مرۆڤایەتی بەرەو قۆناغەکانی پێش شارستانییەت بگێڕنەوە. ئەو خاڵە گرنگەش «ئیمان»ە...

بەڵێ، «ئیمان»... کە کاکڵە و گەوهەری مرۆڤایەتییە و هەر ئەویشە کە مرۆڤ لە هەڵسوکەوتی دڕندانەی کێوییەکان دەپارێزێت و پەروەردەیەکی دەکات کە کامێرای چاودێریی مرۆڤی لەسەر بێت یان نەبێت، هەموو ڕەفتارێکی لەگەڵ خۆی و خوای و دەوروبەریدا -بە ڕاستی- مرۆڤانە و مرۆڤدۆستانە بێت. چونکە کامێرایەکی دیکەی چاودێریی خوایی چ لە ئاشکرا و چ لە پەنهان و شوێنە تاریک و دوورەدەستەکانیشدا لە ناو هەستی هۆشمەندانەی تاک و کۆمەڵدا دادەنێت و دەرەنجام مرۆڤەکان بە ژیانێک دەژین کە شایستەی پێگەی بڵندی ئادەمیزاد بێت لە میوانداریی نێو کۆشکی گەردووندا.

ئیتر ئەم خاڵە (ئیمان)، بوو بە سروود و تەوەرەی سەرجەم چالاکی و بەرهەمەکانی سیوپێنج ساڵی کۆتایی تەمەنی.

ئەو چالاکی و بەرهەمانەشی بریتین لە «وشە»... نەک چەک و تۆقاندن و ئاوارەکردن و وێرانکاری و کوشتار و ململانێ بۆ کورسی!

جا هۆکارێکی ئەو بایەخە زانستی و ئەکادیمییەی کە لە ئاستێکی جیهانیدا بە نوورسی و بەرهەمەکانی دەدرێت، ئەم نیشانەپێکانەیەتی، دوای ئەوەی کە ڕووداوە درشت و وردەکانی ئەم هەشتا نەوەد ساڵەی دوایی دووربینییەکانی نوورسییان لەو

دیاریکردنەدا سەلماند و تێگەیشتن و هەڵسەنگاندنی پێشینەی ئەویان بۆ پێشهاتەکان پشتڕاست کردەوە.

**پوختەی دوا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی لە بابەتە جۆراوجۆرەکاندا:**

هۆکارێکی دیکەی ئەو بایەخە جیهانی و ئەکادیمییەی کە بە مێژووی ژیان و بەرهەمەکانی بەدیعوززەمان دەدرێت، دەرەنجامی لێکۆڵینەوە زانستییەکانیەتی. نوورسی هیچ کاتێ لاپەڕەی بەرهەمەکانی بە نووسینەوە و داڕشتنەوەی هزر و ئاسەواری کەسانی تر ڕەش نەکردووەتەوە و گواستنەوەی بەری ڕەنجی جگە لە خۆی بۆ ناو نووسینەکانی نەکردووە بە پیشە. بەڵکو هەموو یەکێکی ئەو ڕێسا و پێوەر و تەرازووە گشتییانەی لەمەڕ گەردوون و مرۆڤ و ژیان، کە لە بەرهەمەکانیدا بە زۆری و چڕی پێشکەشی خوێنەرانی کردوون، دەرەنجامی گەلێ تێبینیی ورد و لێکدانەوەی چەندجارە و تاقیکردنەوەی جۆراوجۆرن کە بە کۆشش و تەقەلای «دڵ» و

ئامرازەکانی «ژیری» و پێوەتلانەوەی «گیان» و ماندووبوونی هەستەوەرەکانی دیکەی و شەونخوونی و بەختکردنی حەوانەوەی پێیان گەیشتووە. ئینجا دوای ئەوە لە بۆتەی وشە و ڕستە و دەستەواژەکاندا کردوونی بە دیاری بۆ خوێنەرانی.

جێی سەرسووڕمانی ئەو توێژەرە ئەکادیمییانەیەش لەوەدایە کە زانایانی زانستە پەیوەندیدارەکان، دوای ئەوەی هەریەکەیان لە پسپۆڕیی خۆیدا هەر بابەتێک لە بابەتەکان تاووتوێ دەکات و بەشێکی کات و وزەی لە لێکۆڵینەوەیاندا بەسەر دەبات و ئینجا دەگاتە ئاکامەکان، دەبینێ نوورسی زووتر پێشی کەوتووەتەوە و بە چەند دەستەواژەیەکی پوخت ئەو ئاکامەی بە دەستەوە داوە!

ئەمەش هەر وەک زیرەکیی نوورسی و هاتنی لە پێش سەردەمەکەی دەردەخات، تایبەتمەندییەکی دیکەی «پەیامەکانی نوور»ی مامۆستا بەدیعوززەمانیش پیشان دەدات کە چەند باسێکی زاتی نین هەتا تایبەت بن بە خودی دانەریانەوە، بەڵکو یەکبەیەکی دەستەواژەکانیان دەرەنجامی تاووتوێکردن و ئەزموون و توێژینەوەی بابەتییانەی ساڵانێکی دوورودرێژی زانایەکی زیرەک و وریا و بەسەلیقەن کە بۆ ناساندنی یاسا و پێوەرە کۆمەڵایەتی و گەردوونییەکان و بە مەبەستی کورتکردنەوە و قەدبڕیی ڕێگە، پێشکەشی خوێنەرانی کردوون.

**سەرچاوە:**

ئەم وتارەم لەم بەرهەمانەی مامۆستا بەدیعوززەمانەوە هەڵێنجاوە:

(وتەکان، مەکتووبات، تیشکەکان، پاشبەندەکان، داوەرییەکان، ژیاننامە).

**پەراوێزەکان**

١- سەعیدی نوورسی «کوردی»: چەردەیەک لە خزمەتی زانستی و ڕۆشنبیری، فاڕووق ڕەسووڵ یەحیا، گۆڤاری ژین، ژ ٢، ٢٠١٠، بنکەی ژین.

٢- ئەو بابەتەتەش لە پەراوێزی پێشوودا ئاماژەی بۆ کرا، لەم ڕووەوە یارمەتییەکی باشی خوێنەر دەدات.

# شێخ سەعیدی نوورسی، پەیامی ئاشتیی بێسنوور

**عەبدوڵڵا قەرەداغی**

وێڕای زۆریی سەرچاوە، ئاسان نییە بابەتێک لەبارەی کەسایەتییەکی وەکو شێخ سەعیدی نوورسی (١٢٩٣-١٣٧٩ ک، ١٨٧٨-١٩٦٠ ز)یەوە بنووسرێت. ڕەنگە خودی زۆریی سەرچاوەکان، لەم بوارەدا، گەورەترین ئاستەنگ بن، بە تایبەت ئەگەر نووسەر ناچار بکرێت بابەتێک لە سنووری چەند لاپەڕەیەکی A٤ دا بنووسێت. ڕەنگە بە نیسبەت ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هیچ گۆڕانکارییەک هێندەی گواستنەوەی تورکیا لە دەوڵەتی خیلافەتەوە بۆ عەلمانییەت کاریگەر نەبووبێت. بەڵام شوێنەوارەکانی ئەم کاریگەرییە پتر لە نێو تورکیا بەرچاوتر بوو. ژیانی نوورسی لە سایەی ئەو گۆڕانکارییەدا یەکێکە لە بەرجەستەترین نموونەکانی ئەو ڕاستییە، بە ڕادەیەک، کە بەبێ دوودڵی دەتوانین بڵێین نوورسی «ژیانی خۆی بەخت کرد لەپێناوی پاراستنی ئیسلام لە کۆمەڵێکدا کە لە لایەن بەڕۆژئاواکردن (westernization) و عەلمانیکردن (Secularization)ەوە فەرمانڕەوایی دەکرا» (Yussof & others ٢٠١٣ / ٦٧). هەڵبەتە پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو ڕاستییە بکرێت کە کێشەکە لە خودی عەلمانیکردنەوە هەڵنەقولابوو، بەڵکو لەوەوە کە سەدەی ڕابوردوو «شایەتی پاشکەوتنی جیهانی ئیسلام بوو لەچاو ڕۆژئاوا لە ڕووە کۆمەڵایەتی، ئابووری و سیاسییەکانەوە. ئەم دیاردەیەش، بە دەرکەوتنی سەرکردەی سیاسیی گەندەڵ لە هەر وڵاتێکی دیاریکراودا پتر ڕووی لە خراپی کرد، ئەوانەی دەسەڵاتیان قۆستەوە بۆ بەکارهێنانی داهاتی نیشتمانی لەپێناوی بەرژەوەندیی تایبەتی خۆیاندا» (Ali &

Others ٢٠١٥ / ٢٣٧). ئەم هاوکێشە سەخت و ناهاوتایە لە لایەکەوە تراژیدیای نوورسی و کەسانی دیکەی قورستر کردەوە، بەڵام لە لایەکی دیکەوە ئەو چوارچێوەیە بوو کە بەهێزیی کەسایەتیی شێخی نوورسیی بەرجەستەتر کرد. شێخی نوورسی، ئەو کەسەی بە وردی و لە نزیکەوە دووڕوویی سیاسەتی تاقی کردەوە و سەرنجی ئەوەی داوە «ڕووداوێکی سەرنجڕاکێش: سەردەمێک لە ئەنجامی لایەنگریی سیاسییەوە بینیم کە پیاوێکی ئەهلی عیلمی دیندار، قسەی بە زانایەکی پیاوچاکی خاوەن بۆچوونی سیاسیی جیاواز لە هیی خۆی کرد، تا ڕادەی بە کافرکردنی. هەروەها دووڕووییەکی هاوبۆچوونی سیاسیی خۆیشی بە ڕێزەوە ستایش کرد. بۆیە لەپای ئەم دەرەنجامە بەدەی سیاسەت گوتم (Eûzü

أعوذ – billahi mine sseytani ve ssiyase بالله من الشيطان و السياسة». ئیدی لەو کاتەوە لە گۆڕەپانی سیاسەت پاشەکشێم کرد (Mek ٢٦٧ و Nursi). مایەی ڕامانە وا چەند دەیەیەکە بۆچوونی ئەم پیاوە ڕەشبینە بەرانبەر بە سیاسەت کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر سیاسەت هەیە، نەک تەنها لە نێوخۆی تورکیا، بەڵکو لە دەرەوەش. ئەوەتا ڕێک دوابەدوای وەدەستهێنانی سەربەخۆیی کۆماری ئازەربایجان، پاش کۆتایی شەڕی سارد، هاوشان لەگەڵ کردنەوەی چەند «پەیمانگەیەکی پەروەردەیی لە لایەن پەیڕەوانی زانای ئیسلامی سەعید نوورسییەوە، بزووتنەوەکە ڕێک پاش وەدەستهێنانی سەربەخۆیی وڵات دەرکەوت.» (Valiyev ١٠/٢٠٠٥). بە پشکنینی وردی ڕاستییەکان، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە کاریگەریی ئەم بزووتنەوەیە لە کۆمارەکانی دیکەی ئاسیای ناوەڕاستدا، سەرەڕای ئەوەی دانیشتوانیان شیعەن و ئەمان سوننی، بەرچاوە. هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ میانڕەوی و مرۆڤدۆستیی ئەمان. کوردبوونی شێخی نوورسی هەرگیز جێی مشتومڕ و جیاوازی نەبووە و نییە. ئەوەتا تەنانەت گۆڤارە ئەکادیمییە دیارەکانی نێو تورکیاش ئەوە دووپات دەکەنەوە کە کورد ئەوەی لە بیرە کە «فەیلەسوف و ڕێبەری ئایینی، سەعید نوورسی یەکێک لە پێشینان و باوکی ڕۆحیی بزووتنەوەی خزمەت، کورد بووە.» (Pandya ٧٥/٢٠١٤). لەمەش بەولاوە، نێوەندە زانستییەکانیش هەر بەوە دەیناسێنن کە «زانایەکی ئایینیی سوننیی کورد بووە.» (Ali & others ٢٣٩/٢٠١٥) تا سەرەتاکانی شەستەکانی سەدەی ڕابوردوو (٦٠-١٩٦١)، «سێ کتێبی داناوە کە دوانیان بە کوردی نووسرابوون، بەڵام بە ئاگربەربوون لە کۆشکەکەی تاهیر پاشادا فەوتان» (Yusoff & others ٢٠١٣/ ٧٣). تا ساڵی ١٩٠٨یش چەندین بابەتی لە ڕۆژنامە و گۆڤاری جۆراوجۆردا بڵاو کردووەتەوە، لەوانە ڕۆژنامەی (Şarkve Kürdistan Gazetesi) (Badilli ١٩٩٨ /٣٢)، بەڵام نازانرێ بۆچی لە کۆتایی ئەو ساڵەوە دەستی لە بڵاوکردنەوە لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا هەڵگرتووە. لە سەرجەمی ئەمانەش گرنگتر ئەوەیە کە بێگومان نازناوی (کورد)ی هەبووە. قسە

لەوەش کراوە کە ئەندام بووبێ لە کۆمەڵەی تەعالیی کوردی کە لە ساڵی ١٩١٨دا بە مەبەستی بەرپاکردنی دەوڵەتی کورد دامەزراوە، بەڵام نووسەری وا هەن ئەم بۆچوونانە ڕەت دەکەنەوە، لەوانە، (Akgündüz (?) ٥)، وێڕای ئەمانەش، نووسەری ئەکادیمیی ناسراوی تورک هەن، بەپێی سەرچاوە ئاماژە بۆ بزووتنەوەی نوورجوی کوردی – Kurdish Nurcu Movement – دەکەن (Yavuz & other ١١٧/٢٠٠٦). هەڵبەتە ئاشکرایە کە خودی شێخی نوورسی لە چەندین شوێنی دانراوەکانیدا و سەرجەمی ئەوانەی ژیاننامەی ئەویان نووسیوە، چ پوختە بێت یان درێژ، ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە ئەم زاتە لە دایک و باوکێکی کوردی نەقشبەندیی گوندی «نوورس»ی سەر بە ناوچەیەکی پارێزگای (وان)ە. بەڵام لە هەندێک شوێندا ئاماژە بۆ ئەوەش کراوە کە «تەنانەت (سەعید نوورسی)یش پێی داگرتووە لەسەر نیشتمانپەروەری(Nationalism)*ی ئەرێنیی ئیسلامۆ-تورکی تا کاتێک ئەو نیشتمانپەروەرییە دەتوانرێ بۆ خزمەتی ئیسلام بەکار بهێنرێ.» (Yavuz ٢٢٢/٢٠٠٤).

**نوورسی و صۆفیگەری:**

بە داخەوە ئەم مەسەلەیە بە خراپی وروژێنراوە. یەکێک لە نووسەرە زۆر ئەکادیمییە وردەکان دەڵێ: بزووتنەوە ئایینییە هەرە گرنگەکەی تورکیا، بزووتنەوەی نوور، بە مانا زۆر وردەکەی، تەریقەتێکی صۆفییانە نییە (سیلسیلە -زنجیرەی پیران-ی تێدا نییە، بەیعەی نییە، کۆمەڵە ویرد و ڕێوڕەسمی خۆی نییە.) بەڵام ڕێنماییەکانی لە ڕێگەی گیانی میللیی صۆفییانەوە بڵاو بوونەوە. پتر لەمەش، چەند شێوازێکی جۆراوجۆری توندوتۆڵی نێوخۆ (disciplining)ی گرتە بەر کە ڕێوڕەسمەکانی ئەو تەریقەتانەمان دێننەوە بیر (Bruinessen ٢٠٠٩ / ١٤٢). پێویستە ددان بە دروستیی ئەم بۆچوونەدا بنرێت، چونکە خودی شێخی نوورسی لە دەیان شوێندا باسی لە دووریی خۆی لە تەریقەتەوە کردووە. بەڵام لە هەموو حاڵەتێکدا دەبێ خودی ئەم زاتە بکەینە بەڵگەی بۆچوونەکانمان، ئەویش لە ڕێگەی تەنها چەند نموونەیەکی بەرهەمەکانییەوە.

لە دانراوەکانی خۆیدا دەتوانرێ شوێنپێی گرنگیی صۆفیگەری لای شێخ سەعید هەڵبگیرێ. زۆر باس لە هێندێک بنەما و ویردی تایبەتی زیکرکردن، بەتایبەت لە تەریقەتی نەقشبەندیدا دەکات. بە زۆری ناوی گەورەپیاوانی صۆفیی وەکو شێخ عەبدولقادری گەیلانی، شاهی نەقشبەند، جەلالەددینی ڕۆمی، ئیمامی ڕەببانی و مەولانا خالید و هیی دیکەش دەبات. ناوی تەریقەتەکانی نەقشی، قادری، چەشتی، مەولەوی و کوبرەوی دێنێ. لە کتێبی (barla lahikasi)دا چەندین جار ئاماژە بۆ وشەی «نەقشبەندی» دەکات، لەوانە: لەبارەی گرنگیی وشەی «نوور» لە ژیانی ئەودا، ئاماژە دەکرێ بۆ ئەوەی لە هەر شوێنێکدا بە درێژایی ژیانی ڕووبەڕووی بووەتەوە. یەکێک لە قوتابیانی دووپاتی دەکاتەوە: «جەنابی مامۆستام مەزهەری ناوی شکۆمەندی «نوور»ە. ئەم ناوە شەریفە بە لای ئەوانەوە ناوێکی هەرە مەزنە. گوندەکەی ناوی (نوورس)ە، ناوی دایکی (نووریە)یە، ناوی مامۆستای قادریی (نوورەددین)، ناوی مامۆستای نەقشی (سەید نوور موحەممەد)ە، یەکێک لە مامۆستایانی قورئانی حافز نووری. پێشەنگی هەرە تایبەتی لە خزمەتی قورئاندا: زیننوورەین -مەبەست حەزرەتی عوسمانی کوڕی عەففانە - و ڕوونکەرەوەی بیر و دڵی ئایەتی (النور)ە.» (barla lahikasi?/ ١٤٧). لەبارەی مەولانا خالیدەوە، لە هەمان کتێبدا نووسراوە: «ئەم حەزرەتی مەولانا خالیدە هاوشاریی مامۆستاکەمە و هەم لە پاش ئیمامی ڕەببانییە، بە نیسبەت تەریقەتی نەقشبەندییەوە گرنگترین کەسایەتیی قارەمان -Kahraman-و هەم پیری ئەم تەریقەتەیە.» (Ibid، ١٦٣). پاش ئەمەش، تا دوو لاپەڕەی دیکە باس لە ژیانی مەولانا دەکرێ.

سەعیدی نوورسی

شێخی نوورسی خۆی بە تازەکەرەوەی ڕێچکەکەی مەولانا خالید داناوە و لە ڕوانگەی فەرمـوودەی (**إن اللّه عـز وجـل يبعـث لهـذه الأمـة علـي رأس كلِّ مِئـة سنةٍ مـن يُجَـدِّدُ لهـا دينَهـا**، أبو داود ١٤٣٠ ه ٦ / ٣٤٩، البيهقی ١٤١٢ ه ١ / ٢٠٨ و...تاد.) «وە، واتـە «خوا لـە سـەری هەمـوو سـەد ساڵێکدا کەسێک دەنێرێ دینەکەی بۆ تازە بکاتـەوە.» بـەو پێیـەی مەولانا لـە ساڵی ١١٩٣ی کۆچی لەدایک بووە و ئـەم لـە ساڵی ١٢٩٣ ی کۆچیدا، شێخی نوورسی خۆی بە تازەکـەرەوەی ڕێبازەکـەی ئـەو دەزانێت. بە شێوەیەکی سـەیریش باسی جوببەکـەی ئـەو دەکات کە لە لایەن خاتوو ئاسیای کچی کوچیک عاشیقەوە گەیشتووەتە قوتابییەکی شێخی نوورسی. ئەم زاتە ئەمەش بە کرانەوەیەکی ئیلاهی دەزانێ، بۆ نموونە بڕوانە: BarlaLahikesi, ١٦٣, Kastamonu & Lahikasi, ٩٧, ١٢٠.


**پەراوێز و سەرچاوەکان**

بێگومان مامۆستا (ئیحسان ساڵحی) ڕۆڵێکی گـەورەی بینی لە ناساندنی شێخی نوورسی بەوانـەی بـە عەرەبی دەخوێننەوە. ئەوانەی تەنها کوردی دەزانن، دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ وەرگێڕانەکەی مامۆستا (فاروق ڕەسوڵ یەحیا). بەندە ناچار بووم بگەڕێمەوە بۆ دانراوەکانی شێخ بـە زمانی تورکی.

**ابـو داود ١٤٣٠، السنن، تحقيق الَارنـؤوط و قـره بللي، دار الرسـالة العالمية.**

**البيهقـي ١٤١٢ ه، معرفـة السـنن و الَاثـار، تحقيـق: عبدالمعطـي قلعجـي، دار قتيبـة، بـيروت.**

Akgündüz? Prof. Dr. Ahmmed,BedıüzzemanveGünümüzProblemleriHakkindakiTevsiyeleri. www.bilgelerzirvesi.org/bildiri/ahmedakgunduz/pdf٢

Ali & Others ٢٠١٥, The Establishment of an Islamic Community (Al-Mujtama› Al-Islami): Bediuzzaman Said Nursi&SayyidQutb›s Approaches, International Conference on Empowering Islamic Civilization in the ٢١st Century,

Universiti SultanZainalAbidin, Malaysia.

Badıllı, ١٩٩٨.Said Bediüzzaman Nursimufassaltarihçe-i hayatı. Vol ١, ٢ & ٣. Istanbul: CalışOfset.

Bruinessen ٢٠٠٩, 'Popular' Islam and the' Encounter withModernity, From: Islam and Modernity: Key Issues & Debates, Edited by Masud& others.

(Masud& others (Editors), ٢٠٠٩, Islam and Modernity, Edinburgh University Press.

Nursi, B. S. Risale-I NurKülliyatından, BarlaLahikesiveKastamonuLahikesi, veLemalar, veMektubat,veSualar,Envar NesriyatveCihanNesriyatveMatbaacılık.

Pandya ٢٠١٤, Hizmet and the Kurdish Question in Southeastern Turkey and Iraq, Turkish Journal of Politics(TJP), Vol. ٥ No. ١ Summer.

Valiyev ٢٠٠٥, Azerbaijan: Islam in a Post-Soviet Republic, Middle East Review of International Affairs (MERIA), Vol. ٩, No. ٤, December.

Yavuz ٢٠٠٤, Is There a Turkish Islam? The Emergence of Convergence and Consensus,Journal of Muslim Minority Affairs, Vol. ٢٤, No. ٢, October.

Yavuz&özjan ٢٠٠٦, The Kurdish Question & Turkey›s Justice & Development Party, Middle East Policy, Vol. XIII, No. ١, Spring.

Yusoff& Others ٢٠١٣, Transition in Turkey: An overview of Bediüzzaman Said Nursi, His Life and Works for Medresetü'z-Zehra,International Journal of West Asian Studies , Vol. ٥ No. ٢. Malaysia.

### بەشێک لە وتاری

# سەعیدی نوورسی، زانایەکی خەباتکار و پەیامێکی ڕووناک

**فەرهاد شاکەلی**

ئەم نووسینە بەشێکە لە لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژ بە ناونیشانی (کورد و مێژووی بیر) کە لە ١٩٩٠ەکاندا نووسراوە و هەر ئەو سەردەمە بە چەند بەشێک لە مانگنامەی (پەیام)دا کە لە لەندەن دەردەچوو، بڵاو کرایەوە. دواتر سەرجەمی لێکۆڵینەوەکە بوو بە پاژێک لە کتێبی (کە بازنە و لاکێشەکان هەڵدەوەشێنەوە) دا. بۆ گواستنەوە و ئاماژەپێدان، زانیارییەکانی سەرچاوەکە بەم جۆرەن:
شاکەلی، فەرهاد: کە بازنە و لاکێشەکان هەڵدەوەشێنەوە: ئاخاوتەی سیاسی و فەرهەنگیی کورد؛ دوێنێ و ئەمڕۆ، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ٢٠١٠، لاپەڕە: ٢١-٥٩.

ساڵانی پێش هەڵوەشانەوە و ڕووخانی ئیمپراتۆریی عوسمانی و دامەزرانی دەوڵەتی تورکیای کۆماری، ساڵانێکی پڕ لە بزووتنەوە و گۆڕانکاری و نائارامی و نیگەرانیی فکری و سیاسی بوون. لە زۆربەی لایەنەکانی ژیانی فەرهەنگی و سیاسیدا ئەم نائارامییە بەدی دەکرێت و لە ژیان و بەرهەمی بیریاران و ڕووناکبیرانی سەردەمەکەیشدا دیارە. ئەمە سیمایەکی گشتیی ئەو کۆمەڵگەیانەیە کە بەرەو گۆڕانێکی

بنەڕەتیی بورکانئاسا دەڕۆن و ناکۆکیی نێوان قانوون و بنەما کارپێکراوەکان و ڕەوتی بەرەوپێشەوەچوون دەگاتە ڕادەی نەگونجان و تەقینەوە.
شێوەی تاکڕەوانە و دیکتاتۆریی دەوڵەتی عوسمانی و پەرەسەندنی گیانی شۆڤینیزمی تورکی بەرانبەر گەلانی بندەستی ئیمپراتۆرییەکە گەیشتبووە پلەیەک کە ئیدی بە ڕیفۆرمی هەندێ قانوونی گشتی چارەسەر نەدەکرا. ئەگەرچی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم ناچار کرا تەختی سەڵتەنەت بەجێ بهێڵێت و هەندێ گۆڕینی دەستوورییش کرا، بەڵام ئەمەیش نەیدەتوانی باری شێواوی ناوچەکە ئارام بکاتەوە. بەشی هەرە زۆری گەلانی ژێردەستی عوسمانی ڕێگەی شەڕی ڕزگاریی نەتەوایەتی و دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆیان هەڵبژارد.
لە ناو ڕووناکبیر و خوێنەوار و خەباتکارانی سیاسیی ئەو سەردەمەدا دوو تەوژمی فکری زیاتر لە برەودا بوون و هەڵوێستی ئەو کەسانە و ڕەوتی ڕووداوەکانیان ڕەنگرێژ دەکرد: پانئیسلامیزم و بیری ڕزگاریی نەتەوایەتی، یا ناسیۆنالیزم. بیروباوەڕی پانئیسلامیزم و یەکێتیی گەلانی موسوڵمان، لە سالانی ١٨٧٠-١٩٠٨دا لە ناو ڕووناکبیر و زاناکانی ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدا هێزێکی بزوێنەر و گرنگ بوو. بەڵام بیری پانئیسلامیزم لە دوو پلەی جیاوازدا و بە دوو شێوەی جیاواز دەردەبڕدرا؛ بیروباوەڕی سوڵتان و حکومەت کە دەیانویست بە ڕێگەیەکی بیرۆکراسییانە یەکێتیی گەلانی ئیسلام بپارێزن و بیروباوەڕی زانا و ڕووناکبیر و خوێنەوارەکان کە دەیانویست شێوەیەکی نوێ و کاریگەر بۆ یەکگرتنی گەلان بدۆزنەوە. پێشینەی ئەم دوو شێوەی بیرکردنەوەیە، یا جۆرێکی دیکە کە لە لێکنزیککردنەوەی هەردوویان پێک هاتبێت، لای بیریارانی وەک جەمالوددین ئەفغانی (١٨٣٨-١٨٩٧) و شێخ محەمەد عەبدوڵڵا (١٨٤٩-١٩٠٥) دەبینرێت.
ئەگەرچی ناسیۆنالیزم لای گەلانی ڕۆژهەڵات ڕەگوڕیشەیەکی یەکجار مێژوویی و قووڵی هەبوو، بەڵام بە شێوە سیاسییە نوێیەکەی لە ئەورووپاوە دەگەیشتە وڵاتی عوسمانی. گەلانی بندەستی عوسمانی، بە کوردیشەوە، خەباتیان بۆ ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی عوسمانی و دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوایەتی دەکرد. ئەم هۆشیارییە هەمیشە لە پلەی جیاوازدا بووە و لە نەتەوەیەکەوە بۆ نەتەوەیەک و لە سەرکردەیەکی سیاسییەوە بۆ یەکێکی دی گۆڕاوە. ئەو نموونانەی ئەورووپایش کە لە وڵاتی عوسمانیدا دەبوونە ئیلهامبەخش، بە زۆری ئەوانە بوون کە وێنەی ڕێکخستنی پۆلایین و یەکجار نهێنی، یا سەرکردەی پاڵەوان و کاریزماتیکیان پێشکەش دەکرد؛ کۆمەڵەی کاربۆناری یا سەرکردەیەکی وەک جوسێپ گاریباڵدی (١٨٠٧-١٨٨٢).
کۆلۆنیالیستەکانی ئەورووپا دەوڵەتی عوسمانی و دینی ئیسلامیان بە بەرهەڵستێکی یەکجار گەورە دادەنا لە ڕێگەی خۆیاندا بۆ داگیر و دابەشکردنی دنیا و دەستگرتن بەسەر سەرچاوە گرنگەکانی کەرەستەی خاو و بازاڕی فرۆشتنی کاڵا پیشەسازییەکانیاندا. بۆ نەهێشتنی ئەم کۆسپەیش، هەموو شێوەیەکی سیاسی و دیپلۆماتیک و سەربازی و فکرییان دەخستە گەڕ. برەوپێدانی بیری ناسیۆنالیزم لە ناو گەلانی بندەستی عوسمانیدا بە شێوەیەکی سیاسیی ڕووتی وا کە دەمە تیژەکەی ڕووی لە دەوڵەتی عوسمانی بێت و ئاکامەکەیشی شێوە سەربەخۆییەک بێت لە بازنەی بەرژەوەندیی خۆیان نەچێتە دەرەوە، یەکێک بوو لە چەکەکانی دەستی کۆلۆنیالیستان. ئەوان هەڵوەشاندنەوە و پاچەپارچەکردنی ڕۆژهەڵات، بە تایبەتییش ڕۆژهەڵاتی ئیسلامییان دەویست، نەک هۆشیاربوونەوە و ڕزگاریی گەلان. لەبەر ئەوە هیچ سەیر نەبوو کە ساڵانێک دواتر جاسووس و هاوجنسبازێکی وەک تۆماس ئیدوارد لۆرەنس (١٨٨٨-١٩٣٥) ببێتە پاڵەوانی ڕزگاریخوازی، یا ژنە جاسووسێکی وەک گێرتروود بێڵ (١٨٦٨-١٩٢٦) ببێتە ئەندازیاری دامەزراندن و پێکەوەنانی دەوڵەتی عیراق.
بێجگە لەو دوو تەوژمە فکرییە، هەندێ بیروباوەڕی دیکەیش هەبوون کە زۆرتر پێوەندییان بە شێوازی بیرکردنەوە و هەڵوێست بەرانبەر دیاردەکانی نوێکردنەوەوە هەبوو. ئەو گەشەکردن و پێشکەوتنە خێرا و بنەڕەتییانەی لە بوارەکانی فەلسەفە و فیزیک و تەکنۆلۆگیدا هاتبوونە کایەوە، دیاردەی ئەوتۆیی نەبوون کە ڕووناکبیرێک خۆی لێیان بێدەنگ بکات و کاری پێیان نەبێت. ئەمە ئاکامێکی سیاسیی ڕاستەوخۆیشی لێدەکەوتەوە کە ناوی سێکولاریزمی لێ نرابوو.

لە ناو ڕووناکبیر و سیاسەتکار و خوێندەوارە کوردەکانی ئەو سەردەمەدا، کە ئەستەنبووڵ بووبووە ناوەندی کۆبوونەوە و چالاکییان، ڕەنگدانەوەی ئەم بیروباوەڕانە، بەڵام لە پلەیەکی نزمدا، بەدی دەکرێت و کاریان کردووەتە سەر هەڵوێست و بەرهەم و ڕێڕۆی ژیان و خەباتیان. کەسایەتییەکی یەکجار گرنگ کە جێدەستی بیر و هەڵوێست و ڕێڕۆی ژیانی بە گەلێ لایەنی سیاسی و فکریی کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هەندێ وڵاتی دیکەی دنیایشەوە دیارە، سەعیدی نوورسییە. ژیانی فکری و ئیدیۆلۆگیی شێخ سەعیدی نوورسی پڕە لە نموونەی سەرنجراکێش و هەژێنەری وا کە بێگومان شایانی ئەوەیە بە قووڵی لێی بکۆڵرێتەوە و بە چاوێکی ڕەخنەگرانە و زانستییەوە تەماشا بکرێت.

بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی (١٨٧٦-١٩٦٠) نووسەری (ڕیسالەی نوور= ڕووناکینامە، نامە یا پەیامی ڕووناکی) لە گوندی (نوورس)ی هەرێمی بەتلیس، لە سەرووی کوردستان لەدایک بووە. نوورسی لە سەرەتادا لە مەدرەسەی سەییدی نوور خوێندوویەتی، بەڵام هەر زوو وازی لەم هێنا و لای شێخ محەمەدی جەلالی لە بایەزید دەستی بە خوێندنێکی قووڵ کرد و بوو بە مەلا. بەڵام دواتر هەر لەسەر خوێندنی سەربەست بەردەوام بوو. بە هۆی گەڕانەوە بە ناوچەکانی کوردەواریدا پێوەندییەکی پتەوی لەگەڵ خەڵکی ئاساییدا پەیدا کرد و ئەوینێکی پتەو بۆ سروشت لە دەروونیدا دروست بوو کە هەتا لە ژیاندا مابوو گۆڕانی بەسەردا نەهات. پلەی بەرزی خوێندەواری و ڕووبەڕووبوونەوەی لەگەڵ دەسەڵاتدارانی عوسمانیدا هەر زوو ناوبانگێکی بۆ شێخ سەعید پەیدا کرد. ماوەیەک بە (مەشهوور) ناسرابوو، دواتریش، لە ١٨٩٤ەوە بە (بەدیعوززەمان). لە ١٩٠٤ەوە ناسناوی (غەریب)ی بۆ خۆی دانابوو، بۆ دیاریکردنی شێوەی بیرکردنەوەی جیاوازی خۆی. ئەو بە جلە کوردییەکانیەوە و بە خەنجەرێکەوە زیاتر لە کوردێکی خێڵەکی دەچوو تا مەلا و زانایەکی لێهاتوو. نوورسی لە سەرەتای ژیانی ئەدەبیی خۆیدا کۆمەڵێ وتاری بە کوردی و بە تورکی لە ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەو سەردەمەدا بڵاو کردەوە کە ئاخاوتنەکەی تا ڕادەیەکی زۆر ئاخاوتنی کوردێکی نیشتمانپەروەر و شۆڕشگێڕ بوو.

نوورسی دوو ساڵی لە بەتلیس وەک میوانی عومەر پاشا بردووەتە سەر. دواتر ساڵی ١٨٩٤ چووەتە (وان) و لە ماڵی تاهیر پاشای والیدا ژیاوە. لەوێ ئاشنایەتیی لەگەڵ زانستەکانی سروشت و فیزیکدا پەیدا کرد و مێتۆدەکانی ئەو زانستانەی بەکار هێنا بۆ فێرکردنی زانستە ئیسلامییەکان و پیشاندانی هێزی بڕوا. هەر لێرەیشەوە گەیشتە ئەو باوەڕەی کە چارەسەر و پێشکەوتن تەنها بە ئیمان و باوەڕ نابێت، بەڵکە دەبێ لەگەڵ زانستدا کۆ بکرێتەوە. ئەمە سەرەتای خەریکبوونی نوورسی بوو بە مەسەلەکانی فەلسەفەوە کە تا ساڵی ١٩٢٠ی گرتەوە.

لەو ماوەیەدا کە لە (وان) دەژیا، نوورسی قسەیەکی (گۆڵدستۆن)ی سیاسەتمەداری ئینگلیزیی لیبراڵ دەخوێنێتەوە کە گوتوویەتی ئێمەی ئینگلیز ناتوانین موسوڵمانەکان بخەینە ژێر دەستی خۆمانەوە تا قورئانیان لێ نەستێنینەوە. دەڵێن نوورسی سوێندی خواردووە کە بۆ دنیای ڕوون بکاتەوە کە قورئان هەتاوێکی ڕۆحییە و لە شکان نایەت.

ساڵی ١٩٠٧ گەیشتە لای سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٤٢-١٩١٨). بەڵام شێوە و جلوبەرگەکەی و داواکردنی دامەزراندنی زانستگەیەکی کوردی لە بەتلیس و سووربوونی لەسەر ئەوەی کە ئیسلام زۆرداری قەبووڵ ناکات (مەبەستی زۆرداریی سوڵتان بوو)، بوو بە هۆی ئەوەی بدرێتە دادگای سەربازیی یڵدز و دواتر بخرێتە شێتخانەیەکەوە. ئەمە نیشانەیەکی ئاشکرای ئەوە بوو کە ئەو دوو شێوە جیاوازەی بیری پانئیسلامیزم پێکەوە هەڵیانەدەکرد.

سەعیدی نووری

شێخ سەعیدی نوورسی هێشتا ڕەواڵی بوو کە بەتلیسی بەجێ هێشت و ڕووی کردە وان. ئەو دەمە زیاتر خەریکی خوێندنی زانستی کەلام (تیۆلۆگی) بوو، بەڵام لە تەسەوف و شێخانی هەردوو تەریقەتی نەقشبەندی و قادرییشەوە نزیک بوو. ئەگەرچی تەمەسسوکی بە هیچ شێخێکیشەوە نەکرد، بەڵام کارکردی تەسەوف بە هەموو نووسینەکانیەوە دیارە. هەر لەو تەمەنەیشدا کەوتە سەر بیری ئەوەی لە کوردستاندا زانستگەیەکی گەورەی وەک (ئەزهەر)ی میسر دابمەزرێنێت و ناوی بنێت خوێندنگەی زەهرا کە لە پاڵ زمانانی کوردی و عەرەبی و تورکیدا، زانستی نەریتانە و دینی و زانستە نوێیەکانیش بخوێنرێن. ئامانجی نوورسی ئەوە بوو وەک خۆی دەیوت، ئەهلی مەکتەب (خوێندنگە نوێیەکان) و ئەهلی مەدرەسە (مزگەوتەکان) و ئەهلی تەکیە (سۆفییەکان) لە یەک چوارچێوەی زانستیدا کۆ بکاتەوە. بیری ئەم زانستگەیە هەتا ساڵی ١٩٥١یش لای نوورسی هەر مایەوە. چوونی نوورسی بۆ ئەستەنبووڵ بۆ ئەوە بوو کاریێ بکات دەوڵەت یا سوڵتان پشتی بیری دامەزراندنی ئەو زانستگەیە بگرن. بەڵام مەبەستێکی دیکەیشی ئەوە بوو بچێتە ناو کۆڕی زانایانەوە و لەگەڵیاندا بکەوێتە باسوخواس و دیالۆگی زانستی.

کە لە تەمووزی ١٩٠٨دا بزووتنەوەی گرۆی (ئیتیحاد و تەرەقی) دەستی پێ کرد، نوورسی پشتگیریی بیری چەسپاندنی دەستووری کرد، ئەگەرچی هەر زوو لەوانەیش بێئومێد بوو. ڕەنگە ئێستا سەیر بێتە پێشچاو کە نوورسی دژی سوڵتان بێت و پشتگیریی دەستووریێ بکات کە ڕێگەی بۆ پەیدابوونی ڕێژیمی کۆماری خۆش کرد، بەڵام لەو سەردەمەدا لە تورکیایش و لە ئێرانیش زانایانی ئیسلام (مەشرووتییەت)یان بە هاوواتای (مەشرووعییەت) دادەنا.

لە سەرەتای شەڕی یەکەمی گێتیگردا نوورسی گەیشتە لای سوڵتان محەمەد ڕەشادی پێنجەم (١٨٤٤–١٩١٨) و سەرلەنوێ باسی زانستگەی زەهرای هێنایە گۆڕێ. دەڵێن سوڵتان نۆزدەهەزار لیرەی بۆ دامەزراندنی تەرخان کردووە و بناغەکەیشی لە کەناری زەریاچەی وان دانراوە، بەڵام بە هۆی هەڵگیرسانی شەڕەوە سەری نەگرت.

کە ڕووسەکان لە سەرەتای شەڕەکەدا هاتنە ناو کوردستانەوە و دواتر شاری وانیان گرت، نوورسی دژیان ڕاوەستا و خەڵکێکی زۆری بۆ شەڕیان کۆ کردەوە. هەر لەو دەمانەدا بوو کە دەستی کرد بە نووسینی کتێبی (اشارات الاعجاز). لە شەڕێکدا نوورسی دیل کرا و ڕووسەکان ڕەوانەی سیبیریایان کرد. دوای دوو ساڵ خۆی لە دەستیان ڕزگار کرد و بە سانت پیتەرسبورگ و وارشۆ و ڤییەننادا لە ١٩١٨دا خۆی گەیاندەوە ئەستەنبووڵ. لەو کاتەدا ئەستەنبووڵ لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتانی ڕۆژاوا، بە تایبەت بریتانیادا، بوو. نوورسی کرا بە ڕاوێژکاری شێخولئیسلام.

دوو ساڵ دواتر گۆڕانێکی گەورە بەسەر بیر و دنیای فکریی نوورسیدا هات. بیری لەوە دەکردەوە کە هەموو شتێک بەرەو گۆڕان دەچێت، کە دنیایەکی کۆن هەڵدەوەشێتەوە و دنیایەکی تازە لە جێگەی

سەعیدی نوورسی

دادەمەزرێت. ئەگەر تا دوێنێ زۆرداریی سوڵتان و حوکمی ناڕەوای دەوڵەت ڕێگر بوون، لە دنیای تازەدا هەڕەشەی ترسناکتر و ترکزەی گەورەتر بەڕێوە بوون. دەبوو بەرانبەریان ڕاوەستێت، دەبوو هێزێکی دیکە و شێوەیەکی دیکە بەکار ببات.

لەم سەردەمانەدا بوو کە قۆناغێکی تازە لە ژیانی نوورسیدا دەستی پێ کرد و بوو بە هێڵێکی جیاکەرەوەی نێوان دوو جۆرە کەسایەتی، دوو جۆرە سەعید؛ سەعیدی کۆن و سەعیدی نوێ. سەعیدی کۆن کەسێک بوو تا سنووری لووتبەرزی ئاگاداری بەهرە و توانستەکانی خۆی بوو، بەگژ زانایاندا دەچوو، حەزی لە چالاکیی سیاسی و کۆمەڵایەتی بوو، بەڵام سەعیدی نوێ کەسێک بوو بێفیز، خۆی لە ڕووبەڕووبوونەوە دەبوارد، لە سیاسەت دوور دەکەوتەوە و پاشەکشێی هەڵدەبژارد، بۆ خۆئامادەکردنێکی دیکە و بۆ شێوەیەکی دیکەی کارتێکردن و گۆڕین.

نوورسی لە کەناری بۆسفۆر، لە گوندی سارییەر چووە خەڵوەتەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی قورئان، (فتوحات الغیب)ی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧-١١٦٦) و نامەکانی شێخ ئەحمەدی سرهندی (١٥٦٤-١٦٢٤). ئەم بیرکردنەوە و خوێندنەوانە بوون بە هۆی ئەوەی دەست بکات بە نووسینی ئەو شاکارەی کە سەرتاپێی ژیانی خۆی بۆ تەرخان کرد؛ ڕیسالەی نوور (پەیامی ڕووناکی).

لە ساڵی ١٩٢٣دا لەسەر داوای نوێنەرە کوردەکانی ئەنجومەنی نیشتمانیی تورکیا چوو بۆ ئانکارا و لە بەردەم ئەنجومەندا وتارێکی پێشکەش کرد. لەو ئاخاوتنەدا نوورسی بە ڕاشکاوی بەرگریی لە ئیسلام کرد و هێرشی کردە سەر فەرهەنگی ئەورووپا و ڕۆژاوا. مستەفا کەمال (١٨٨١-١٩٣٨)ی سەرۆکی تورک قسەکانی نوورسیی پێ خۆش نەبوو. دوای ئەمە نوورسی ڕووی کردەوە کوردستان و لە ئەشکەوتێکدا لە نزیکی وان خۆی بە خواپەرستی و بە بیرکردنەوەوە خەریک کرد. لەم کاتەدا بوو کە ڕاپەڕینی شێخ سەعیدی پیرانی نەقشبەندی (١٨٦٥-١٩٢٥) هەڵگیرسا. لەبارەی هەڵوێستی نوورسییەوە سەبارەت بە ڕاپەڕینەکە گەلێ بیروڕای جیاواز هەن. بەڵام ڕق و دوژمنایەتیی بێسنووری تورکەکان بەرانبەر نوورسی ئەوە دەردەخات کە دەبێ پشتگیری ڕاپەڕینەکەی کردبێت، چونکە هەر یەکسەر دوای دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینەکە نوورسی دوور خرایەوە بۆ بوردور لە ئەناتۆڵیای ڕۆژاوا بە تاوانی ئاژاوەنانەوە و هەڵگیرساندنی شۆڕش. ئەمە سەرەتای سەردەمێکی ٣٥ ساڵەی پڕ لە ئێش و دەردیسەری و ڕاونان و دەستبەسەری و ئازاردان و دوورخستنەوە بوو لە شارێکەوە بۆ شارێک و لە جێگەیەکەوە بۆ جێگەیەکی دی. ئیدی لێرە بەدواوە هەموو تەمەنی نوورسی هەر ئەم ئەشکەنجە فیزیکی و ڕۆحییە بوو، بەڵام هاوکاتیش ئەو هەر لەسەر نووسین بەردەوام بوو. لێرە کتێبی (یەکەم دەرگاکانی ڕووناکی)ی نووسی کە بوو بە پێشەکیی پەیامی ڕووناکی. لایەنگرانی نوورسی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زۆرتر دەبوون و نووسینەکانی زیاتر بە ناو خەڵکیدا بڵاو دەبوونەوە. لەوێیشەوە دوور خرایەوە بۆ بارلا و لەوێ بە تەواوی دەستی کرد بە دانانی ڕیسالەی نوور، کە تا ئەو ڕۆژەی کۆچی کرد، ١٣٠ بەشی لێ نووسیبوو.

ئەگەرچی نوورسی دوورخراوە بوو و کەسوکار و خزمەکانی سەریشیان لێ نەدەدا و خۆی بۆ لێکدانەوەی قورئان تەرخان کردبوو، کەچی لە ساڵی ١٩٣٤دا درایە دادگا بە تاوانی ئەوەی ڕێکخراوێکی نهێنیی دینیی دامەزراندووە بە نیازی هەڵتەکاندنی پایە و بناخەکانی ڕێژیمی کۆماری. نوورسی و ١٢٠ کەس لەوانەی نووسینەکانی ئەویان دەنووسییەوە و بڵاو دەکردەوە، لە ئەسکی شەهر هێنرانە پێش دادگا و شەش مانگیان بۆ نوورسی بڕییەوە. لە بەردەم دادگادا نوورسی خۆی پارێزگاریی لە خۆی کرد و تۆمەتی بەکارهێنانی دین بۆ مەبەستی سیاسیی بە درۆ خستەوە و وتی دین هەموو بوون دەگرێتەوە،

چۆن لە ڕچەی تەسکی سیاسەتدا جێی دەبێتەوە؟ ئەمە وەک ئەوە وایە بتەوێ ئۆقیانووسێک بکەیتە گۆزەیەکەوە.
دوای بەسەرچوونی ماوەی زیندان، نوورسی لە شاری کاستەمۆنو نیشتەجێ بوو. ئەگەرچی لەژێر چاودێرییەکی یەکجار توندی پۆلیسدا بوو، بەڵام نووسینەکانی بە شێوەیەکی سەیر بڵاو دەبوونەوە، ڕوونووس دەکران و ئەمدەست و ئەودەستیان پێ دەکرد. پێوەندییەکی فراوانی بە خەڵکەوە هەبوو. لایەنگری لە هەموو لایەک هەبوون و ئەمە وای کرد کە بە نامە بەسەریان بکاتەوە. ئەم نامانەی نوورسی لە پاڵ ڕیسالەدا بوون بە کۆڵەکەیەکی گرنگی بیروباوەڕەکانی. لە ساڵی ١٩٤٣دا لە دەنیزلی دیسان درایە دادگا هەر بەو تۆمەتەی پێشوو. بەڵام ئەم جارە دادگا باشتر خۆیی ئامادە کردبوو. ئەو بەشانەی ڕیسالە کە لە بەردەستدا بوون، نێردران بۆ پرۆفیسۆر و شارەزایانی زانستگەکانی ئانکارا و ئەستەنبووڵ. وەرامی ئەوان ئەوە بوو کە ئەمە نووسراوێکی دینییە و هیچی سیاسیی وای تێدا نییە کە بە تاوان دابنرێت. ئەگەرچی نوورسی بێتاوان دەرچوو، بەڵام هەر وازیان لێ نەدەهێنا و هەمیشە لەژێر چاودێرییەکی توندا بوو. تەنانەت هەوڵیان دا دەرمانخواردی بکەن و بیکوژن. لەوێوە بردیانە ئەمیرداغ لە نزیکی ئافیۆن. ئەو هەر لەسەر کاری خۆی بەردەوام بوو. ئەم هەموو دەربەدەری و زیندانکردنە ورەی نوورسییان زیاتر بەرز دەکردەوە. ئەو بەندیخانەی بە لاوە جێگەی بیرکردنەوە و بەخۆداچوونەوە بوو. دەیگوت زیندان (مەدرەسەی یوسفییە)یە، خوێندنگەیەکە بۆ پەروەردەکردنی ڕۆح و بارهێنانی بیر. زنجیرەی دادگاییکردنەکانی نوورسی هەر وا بەردەوام بوو. ساڵی ١٩٤٧ دیسان لە ئافیۆن برایە بەردەم دادگا. ئەم جارە ١٥ کەس لە هاوکارە نزیکەکانی و هەندێکیش لەوانەی ڕیسالەیان لە شارەکانی دیکەدا ڕوونووس کردبوو، گیرابوون و تاوانی ئامادەکراویش ئەوە بوو کە ویستوویانە بناخە سێکولێرەکانی دەوڵەت هەڵتەکێنن و ڕێکخراوێکی نهێنییان دامەزراندووە. نوورسی بە بیست مانگ بەندکردن حوکم درا. دادگایەکی بەرزتر حوکمەکەی هەڵوەشاندەوە، بەڵام هەر زوو جارێکی دیکە گیرایەوە و درایە دادگا. ئەم جارەیان نوورسی بێتاوان دەرچوو و لە سێپتێمەری ١٩٤٩دا ئازاد کرا، دوای ئەوەی دوو ساڵ دەستبەسەر بوو.
پەیامی ڕووناکی ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە ناو خەڵکدا بڵاو دەبووەوە. لەم ماوەیەدا لە شارەکانی کوردستانیش، بە تایبەت لە دیاربەکر، خەڵکی دەستیان کردبووە پەیداکردن و خوێندنەوەی. گۆڕانێکی گرنگی دیکە ئەوە بوو لە ناو خوێندکارانی زانستگەکانی ئانکارا و ئەستەنبووڵیشدا بیروباوەڕ و نووسراوەکانی نوورسی دەخوێنرانەوە و لایەنگریان پەیدا کردبوو. ئەگەر ڕیسالە جاران لە بازنەیەکی تەسکی خوێندەوار و خواپەرستانی نەریتخوازدا ناسرابوو، ئێستاکە گەیشتبووە بەر دەستی خوێندەوار و ڕووناکبیرانی تازەیش.
لە مایسی ١٩٥٠دا وا پێدەچوو هەلومەرجی وڵاتەکە باشتر بووبێت. عەدنان مەندەرەس (١٨٩٩–١٩٦١) بوو بە سەرۆکوەزیر و لە گوتارەکانیدا ئەوەی جەخت دەکرد کە تورکیا وڵاتێکی ئیسلامییە و بە ئیسلامەتی دەمێنێتەوە. نوورسی نامەیەکی بۆ نووسی و بە «پاڵەوانی ئیسلام» ناوی برد و داوای کرد تا دەسەڵاتی بە دەستەوەیە، چاودێریی بنەماکانی ئیسلام بکات. بەڵام هەر زوو دەرکەوت ئەم مەیلەی مەندەرەس کارێکی هەلپەرستانە بووە بۆ سەرکەوتن لە هەڵبژاردندا. سەعیدی نوورسی جارێکی دیکەیش درایەوە بە دادگا، چونکە بەشێکی ڕیسالە بە ناونیشانی (ڕێبەری لاوان) لە زانستگەی ئەستەنبووڵدا بڵاو کرابووەوە.
نوورسی لەو بەشەدا باسی ئەوەی کردبوو کە جلی ئیسلامی بۆ جوانیی ژنان و پاراستنی کەسایەتییان، لە جلی لەدەرەوەهێنراو لەبارترە. هەروەها ئەوەی نووسیبوو کە پێویستە بنەماکانی ئیسلام لە پلەکانی خوێندنگەدا بخوێنرێن. وتاری بەرگرییەکەی نوورسی یەکێک بوو لە گەرمترین وتارەکانی. ڕووی لە داوەران کرد و وتی ئایا پێویستە ژنان لەشی خۆیان پیشان بدەن و منداڵان لە دین ناشارەزا بن بۆ ئەوەی دەوڵەتی سێکولاریست بپارێزرێت؟ ئەگەر وەرام بەڵێیە، ئایا دەوڵەتێکی ئاوا شایانی پاراستنە؟ لە ئەنجامدا نوورسی ئازاد کرا. هاوبیران و لایەنگرانی لە ئەستەنبووڵ کردیانە جەژن، بەڵام پۆلیس هەر زوو ناچاریان کرد شارەکە بەجێ بهێڵێت و ناردیانەوە بۆ ئەمیرداغ.

ساڵی ١٩٥٣ نوورسی چووە ئیسپارتە و ئیتر هەتا ماوەیەکی کورت پێش کۆچی یەکجارەکیی هەر لەوێ مایەوە. ئەم ساڵانە پڕ بەرهەم بوون و هەندێ لە بەشە هەرە گرنگەکانی ڕیسالە لێرە نووسران. لەم ساڵانەدا پەیامی ڕووناکی بە شێوەیەکی یەکجار بەرین بە ناو خەڵکدا بڵاو بووەوە، بە تایبەت لەبەر ئەوەی بۆ یەکەم جار چەند بەشێکی چاپ کرا. پێشتر هەر بە دەست دەنووسرایەوە. ڕاونان و هەراسانکردنی نوورسی و لایەنگرانی دیسان هەر بەردەوام بوو، بەڵام دوای هەموو گرتن و دادگاییکردنێکیش ئازاد دەکران. ڕاستییەکەی ناوەڕۆکی بێزیانی نووسراوەکان دەمێک بوو لای دەسەڵاتداران ئاشکرا بوو. ئەم ڕاونانە تەنها بۆ سووکایەکردن بوو بە ئایین. لە مانگی مارتی ١٩٦٠دا نوورسی لەپڕ چوو بۆ شاری ئورفە لە کوردستان. هەر بە گەیشتنی، دەوڵەت لە ئانکاراوە فەرمانی دا کە دەبێ بگەڕێنرێتەوە بۆ ئیسپارتە. پۆلیس گەمارۆیان دا، بەڵام شێخی نوورسی لە سەرەمەرگدا بوو، لایەنگرانی نەیانهێشت پۆلیس دەستی بۆ ببات. ئەو پیاوەی کە ٣٥ ساڵی تەمەنی پۆلیس ڕاوی دەنا و هەراسانی دەکرد، لە کاتی مردنیشدا هەر بە پۆلیس دەوری گیرابوو. شێخی نوورسی ڕۆژی ٢٣ی مارت کۆچی کرد و دۆستەکانی و دوژمنەکانیشی بەجێ هێشتن. دەسەڵاتدارانی عەلمانی (سێکولاریست)ی تورکیا تەنانەت ترسیان لە تەرمەکەیشی هەبوو. کە کودەتای ٢٧ی مایسی ١٩٦٠ڕووی دا و عەدنان مەندەرەس لە کار خرا، تەرمەکەی نوورسی لە گۆڕ دەرهێنرا و بێسەروشوێن کرا. هەتا ئەمڕۆیش کەس نازانێ چییان بەسەر هێنا.

لە ناوەڕاستی شەستەکان بەدواوە هۆشیاربوونەوەیەکی ئیسلامی لە تورکیادا پەرەی سەند. لەم بزووتنەوە تازەیەدا بیروباوەڕەکانی سەعیدی نوورسی هاندەر و ئیلهامبەخش و سەرچاوەیەکی گرنگ بوون. چاپکردن و بڵاوکردنەوەی پەیامی ڕووناکی گەیشتە پلەیەکی

سەعیدی نوورسی

یەکجار بەرز. پەیام لە هەموو جێگەیەک هەبوو، ئەگەرچی بە ئاشکرایش نەدەفرۆشرا. ڕۆژنامەگەریی ئیسلامی بە شێوەیەکی فراوانتر باوەڕەکانی نوورسییان گەیاندە خەڵک. ڕۆژنامە و گۆڤارەکان هەڵبژاردەی وتەکانی شێخیان بڵاو دەکردەوە و وتاریان لەبارەی ژیان و باوەڕەکانیەوە دەنووسی. لەم بوارەدا مانگنامەی (هیلال) و ڕۆژنامەی (بوگوین) ڕۆڵێکی بەرچاویان بینی. لایەنگرانی نوورسی خۆیشیان دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی چاپەمەنیی تایبەتی خۆیان. ساڵی ١٩٦٤ حەفتەنامەی (حەرەکەت) لە شاری ئەرزوڕووم دەست پێ کرا، کە هەڵبژاردەیەکی پەیامی ڕووناکیی بڵاو کردەوە، سەرەڕای دەنگوباسی تورکیا و جیهانی ئیسلامی. لە شاری ئیزمیر حەفتەنامەی (زولفیقار) و لە شاری کۆنیایش (بەدیعوززەمان). ئەمانە هەموو تەمەنکورت بوون و ساڵی ١٩٦٨ حەفتەنامەی (ئیتیحاد) کە لە ئەستەنبووڵ دەردەچوو و بە هەموو وڵاتدا پەخش دەکرا، جێی هەموویانی گرتەوە. لە مانگی دووی ١٩٧٠دا ئیتیحاد بوو بە ڕۆژنامە و دواتر (یەنی ئاسیا) جێی گرتەوە.

هاوبیرانی نوورسی نەک تەنها لە ڕێگەی چاپەمەنییەوە بیروباوەڕەکانی پەیامیان بڵاو دەکردەوە، بەڵکە دەستیان کرد بە دامەزراندنی ڕێکخراوی سیاسی و فەرهەنگییش. کاری ئەم ڕێکخراوانە یەکجار نهێنی بوو، بەڵام ڕوویەکی چالاکییەکانیان خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی پەیامی ڕووناکی بوو. زۆربەی جار لە بازنە و گرۆی بچووکدا کۆ دەبوونەوە کە لە نێوان دە تا حەفتا کەسێک بەشدارییان تێدا دەکرد. ئەگەرچی ئەم کۆبوونەوانە تەنها بۆ خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی نووسراوەکانی نوورسی بوون، بەڵام دیسانیش زۆر جار پۆلیس پەلاماریان دەدان و هەندێکیان دەگرت. ئەم ڕێکخراو و بازنە فەرهەنگییانە درێژەی باوەڕ و بیر، هەروەهایش ئامانجەکانی نوورسی بوون، بەڵام لە ناویاندا کەسێک هەڵنەکەوت بتوانێ جێگەی نوورسی وەک ڕێبەر و بیریار بگرێتەوە. نوورسی هەمیشە پێی وابوو کە لایەنگرانی دەبێ ڕوو بکەنە بەرهەمەکانی، نەک خۆی وەک تاکەکەس.

پەیامی ڕووناکی بەو مەبەستە نووسرابوو کە ئیعجازی قورئان لە سەردەمی گومان و مادەپەرستیدا پیشان بدات و نوورسی پێی وابوو کە ویستی خودایی ئەوی بۆ ئەو ئەرکە هەڵبژاردووە. کاتێ شێخی نوورسی کۆچی کرد، ١٣٠ بەشی لێ نووسیبوو. هەر بەشێک لەسەر بناخەی چەند ئایەتێکی قورئان دامەزراوە و ئایەتەکان کراونەتە نوختەی دەرچوون بۆ موناقەشەی دوورودرێژی کۆمەڵەباسێکی مەنتیقی و میتافیزیکی. لە ڕێکخستن و بەدووی یەکداهاتنی بەشەکاندا هیچ سیستەمێک ڕەچاو نەکراوە، بەڵکە هەندێ باس و بابەتی قورئان بەپێی بیر و بۆچوونی نوورسی هەڵبژێردراون و بە شێوەیەک لێک دراونەتەوە کە پتر لە ئاخاوتنی سۆفییانەوە نزیکن تا تەفسیرێکی کلاسیک. هەر بەشێکی پەیام ناوی لەمعە (بریسکە) یا شوعاع (تیشک)ە. لە ناو بەشەکانی پەیامدا بایەخێکی زۆرتر بە (سیوسێ وشە) دەدرێ کە بە کاکڵی بەرهەمەکە دانراوە. لە هەندێ بەشدا ئەوە جەخت کراوە کە داهێنراوە تەکنۆلۆگی و زانستییەکان لە قورئاندا پێشبینی و باس کراون. نوورسی دەیوت پەیام تیشکدانەوەی قورئانە، وەک چۆن مانگ تیشکدانەوەی خۆرە. بێجگە لە نووسینەکانی، نوورسی بایەخێکی زۆریشی بە خەون دەدا، هیی خۆی یا کەسانی دیکە و نیشانە و مەعنای تایبەتی لێوە هەڵدەهێنجان. لایەنگرانی نوورسی دەڵێن کۆکردنەوەی زمانی مەجاز و نیشانە لەگەڵ لێکدانەوەی بەناو زانستیدا، دەتوانێ خواناسان لە باوەڕی کوێرانە یا نەریتانەوە (ئیمانی تەقلیدی) ببا بەرەو باوەڕی دڵنیایی (ئیمانی تەحقیقی). کە بیر لەوە بکەینەوە بەشێکی خوێنەرانی پەیام خوێندکارانی زانستگە، کارمەندانی دەوڵەت و پارێزەران بوون، گومان لەوە دەکەین پەیامی ڕووناکی توانیبێتی باوەڕ بداتەوە بە کەسانێک کە باوەڕیان لە دەست دابێت. لایەنگرانی نوورسی ڕەنگە زیاتر لە ناو خواناسان و بڕوادارانی شارە بچکۆلەکانی ئەناتۆڵیادا بووبێتن. پەیام دەبووە هۆی بەهێزکردنی بڕوای ئەمانە.

وەک دەبینین، پەیامی ڕووناکی لێکدانەوەیەکی قورئانە، کەم و زۆر، وەک هەر تەفسیر و لێکدانەوەیەکی دیکە. کەواتە بۆچی دەبێ دەوڵەتی تورکیا بەو شێوە دڕندانەیە لە ماوەی سیوپێنج ساڵدا شێخی نوورسی و لایەنگرانی ئەوی ڕاو

سەعیدی نوورسی

نابێت و بەند کردبێت؟ وەرامەکە دەبێ لە سروشتی سێکولاریزمی تورکیادا بدۆزینەوە. لە کاتێکدا سێکولاریزم ئەوە دەگەیەنێت کە دەوڵەت دەست نەخاتە ناو کاروباری دینەوە، تورک سێکولاریزمی وا لێک دایەوە کە لەناوبردنی دین بکا بە ئەرک و ئامانجی خۆی. نەهێشتنی قانوونی ئیسلامی، گۆڕینی بانگ بۆ تورکی، گۆڕینی ئەلفوبێ، هەڵوەشاندنەوە و قەدەغەکردنی تەریقەتەکان، دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتیی کاروباری دینی بۆ ڕیشەکێشکردنی دین نەک تەنها لە ناو دەوڵەتدا، بەڵکە لە ناو خەڵکیشدا، دوورکەوتنەوە لە گەلانی موسوڵمان، هەندێ ڕووی سێکولاریزمی تورک بوون. شێخی نوورسی، کە پەیامێکی دیکەی پێ بوو، دژی گەلێ لایەنی سێکولاریزمی ئەتاتورک بوو. تۆمەتێکی نەبڕاوەی دەوڵەتی تورکیا بەرانبەر شێخی نوورسی کوردبوونیەتی. نەک تەنها دەوڵەت، بەڵکە تەنانەت زۆریش لە نووسەرانی عەلمانی (سێکولاریست) هەمیشە وایان بڵاو کردووەتەوە کە نوورسی بە ناوی دینەوە ویستوویەتی ئامانجی ڕاستەقینەی خۆی بێنێتە دی: دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی. هەمیشە کوردایەتی و کۆمۆنیستی بە دوو لای یەک هاوکێشە دانراون و نەیارانی کەمالیزمی پێ تاوانبار کراون.

لە ماوەی چل ساڵی ڕابوردوودا لایەنگر و هاوبیرانی نوورسی نەخشێکی گەورەیان لە ژیانی سیاسی و فکری و فەرهەنگیی تورکیادا بینیوە. ئەو ڕێکخراو و پارتی و دەستانەی خۆیان بە بەردەوامیی باوەڕەکانی نوورسی زانیوە و دەزانن، کەم نین. لەم ساڵانەی دواییدا هەستی نەتەوایەتی، یا ڕاستتر، نەبوونی پرۆژە و چارەسەرێک بۆ مەسەلەی کورد لای ئەو ڕێکخراوانە، بوو بە هۆی ئەوەی ئەندامە کوردەکان لە ئەندامە تورکەکان جیا ببنەوە و ڕێکخراوی تایبەتی خۆیان دابمەزرێنن. ئەمانە ئێستاکە دەڵێن نرخەکانی کوردایەتی و ئیسلام پێکەوە دەگونجێنین. ڕێژیمی تورکیا وەک چۆن لە ژیانی شێخی نوورسیدا هەمیشە خەریکی داپڵۆسین و ڕاونانی بوو، ئەمڕۆیش هەر وا نەوەکانی شێخی نوورسی ڕاو دەنێت.

# سەعید نوورسی ناوازەی زەمان... ناوازەی جیهان

**د. تاریق محەمەد**
مامۆستای زانکۆی سەلاحەدین

سەعید نوورسی زانای ناودار و هەڵکەوتووی کورد (١٨٧٦-١٩٦٠ز) هەر لە منداڵییەوە زیرەکی و هێزێکی زۆری لەبەرکردن و توانایەکی دەگمەنی پێوە دیار بووە، بۆیە لای هەر مامۆستایەک وانەی بخوێندایە، دەبوویە مایەی سەرسوورمانی مامۆستاکەی. یەکێک لە مامۆستاکانی نازناوی «بەدیعوزەمان»ی پێ بەخشی و لەو ساتەوە ئەم نازناوە بووەتە ناوی دووەمی سەعیدی ناودار و مەشهوور، بگرە لە جیهانی ئەمرۆماندا زیاتر بە بەدیعوززەمان ناسراوە، واتە ناوازەی زەمان و سەردەم.
هەڵبەتە سەعیدی نوورسی نەک تەنها لە بواری وەرگرتنی زانیاری و پەروەردەیی فێربووندا ئەم نازناوە شایانی باڵایەتی، بەڵکو هەر کەس وێستگەکانی ژیانی ئەم زانایە تەماشا بکات، دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە ئەم مرۆڤە کەسایەتییەکی تایبەتە و ئەو شتانەی کە ئەو هەستی پێ کردوون، ئەو هەڵوێستانەی

ئەو گرتوونی، هیچیان لە کەسی ئاساییەوە دەرناچن. بۆیە نازناوی ناوازەی زەمان بۆ ئەو زاتە شیاوترین ناو و نازناوە.
نوورسی (ناوازەی زەمان) بیری هێندە قووڵ و خەمی ئەوەندە گەورە بوو کە ناوازەیی ئەو سەرانسەری جیهانی گرتەوە، ئەوەتا کۆنگرەی جۆراوجۆر دەبەسترێت بۆ شیکردنەوەی بۆچوونەکانی. لەو کۆنگرانەی گرێ دەدرێن، ئەو کۆنگرە جیهانییەیە کە چەند ساڵ جارێک (دەزگای ئەستەنبووڵ بۆ زانست و کولتوور) لە شاری ئەستەنبووڵ ڕێکی دەخات. ئەم دەزگایە لە ساڵی (١٩٩٣)وە خەریکی سازدانی کۆنگرەکانە لە ئاستی جیهاندا بۆ کەسانی ئەکادیمی و پسپۆڕ و شارەزایانی نووسینەکانی نوورسی. توێژینەوەکانیش بە هەرسێ زمانی تورکی و عەرەبی و ئینگلیزی پێشکەش دەکرێن. تا ئەمساڵ دەزگای ناوبراو (نۆ) کۆنگرەی جیهانیی بۆ (پەیامەکانی نوور) و نوورسی لە ئەستەنبووڵ گرێ داوە. نووسەری ئەم وشانە خۆشەبەختانە ئەمساڵ لەگەڵ چەند مامۆستایەکی تری زانکۆکانی کوردستاندا لەو کۆنگرە جیهانییەدا بەشدار بوو کە نووسەر و ئەکادیمی و لێکۆڵەری ٤٥ وڵات تیایدا ئامادە بوون.
کۆنگرە لەژێر دروشمی (باوەڕ، زانست، ڕەوشت... دوارۆژێکی گەشتر بۆ مرۆڤایەتی) باس و لێکۆڵینەوەی سەبارەت بە نووسینەکانی نوورسی قبووڵ دەکرد. جا لەبەر ئەوەی بیر و هزر و سلوک و ڕەفتاری نوورسی لە بوارە ئەکادیمییەکانی هەموو دونیادا بووەتە مایەی سەرسامی و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کەسایەتیی زانستیی زیاتر بە لای بۆچوونەکانی خۆیدا دەهێنێت، ئەوا لە هەموو لایەک باس و لێکۆڵینەوە پێشکەشی دەستەی ئامادەکاریی کۆنگرەکە دەکرا کە ئەمساڵ زیاتر لە هەموو جارێک باس و توێژینەوە پێشکەش کرا و ژمارەی باسەکان گەیشتبوونە دەوروبەری ٣٠٠ باس. بەڵام نزیکەی ١٠٥ بابەتێک ڕەزامەندیی کۆنگرەیان بە دەست هێنا، ئەو باسانەی کە نزیکتر و گونجاوتر بوون لەگەڵ ناوەڕۆک و تەوەرەکانی کۆنگرەکەدا.
کاتی تەخانکراو بۆ کۆنگرە ٣-٢٠١٠/١٠/٥ بوو. هەر لە ڕۆژی کردنەوەی کۆنگرە لە گەورەترین هۆڵی داخراوی یاریی وڵاتی تورکیادا، لە ناو ئاپۆرەیەکی جەماوەریی گەورەدا و بە بەشدارییەکی دیاری پیاوانی دەوڵەت لە ئاستی سەرۆکی حکومەت بە ناردنی بروسکە و ئامادەبوونی جێگرەکەی بە وتار و هاتنی ژمارەیەک وەزیر و پەرلەمانتار و سەرۆکی شارەوانیی شاری ئەستەنبووڵ و ئامادەبوونی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، ئەوەت بۆ دەردەکەوت کە بیر و ڕەوتی نوورسی چەندە مەردانە توانیویەتی فەزایەکی سازگار ساز بکات بۆ ئەو گەل و دەسەڵاتەی سەدەیەکە هیچ کاتێک بەو جۆرە و تا ئەو ئاستە تەبا و نزیک لە یەکدی یەکتریان نەدیوە. ئەمە لەسەر ئاستی ئەو وڵاتەی کە نوورسی لەپێناویدا قوربانیی زۆری دا. هەرچەندە لە ماوەی ژیانیدا جگە لە ئاوارەیی و دەربەدەری و زیندان و دادگاییکردن هیچی دیکە بە ڕەوای ئەم کەسە گەردوونییە نەدەبینرا، بەڵام نوورسی لە هەموو ئەمانە گەورەتر بوو، چونکە ئەو بۆ هەموو مرۆڤایەتی بیری دەکردەوە و قوربانیی دەدا، ئەو بۆ دونیا و دوارۆژی مرۆڤایەتی هەناسەی دەدا و شەونخوونیی دەکێشا، بۆیە ئەمڕۆ کۆنگرەی جیهانی بۆ ژیان و هزر و ڕەوتی ئەو گرێ دەدرێت.
لە ڕۆژانی خوێندنەوەی باسە پێشکەشکراوەکاندا بە کۆنگرە، لە ناو ئەو هۆڵانەی کە تەرخان کرابوون، چاوت بە نەتەوە و زمان و مەزهەب و ئایینە جیاوازەکان دەکەوت کە هەموویان هاتبوون تاووتوێی لێکدانەوەکانی نوورسی بکەن کە خۆی (٥٠) ساڵ پێش ئێستا ئەم دونیایەی جێ هێشتووە، کەچی ئەمڕۆ لەسەر خوانی هزری ئەو، جیهان بە هەموو ڕەنگێکیەوە، ئایینەکان بە جیاوازییەکانی نێوانیانەوە، کۆ بوونەتەوە. لە ناو کۆنگرەدا کەسی بووزی لە ژاپۆنەوە، جوولەکە لە ئەمەریکاوە، قەشەی مەسیحی لە کەنەداوە، موسوڵمان لە هەموو

سەعیدی نووری

کیشوەرەکانی سەر زەمینەوە، واتە لە زۆربەی وڵاتانی ئیسلامی لە سەر سفرەی نوورسی بە کۆکی کۆ بوونەتەوە.
ئایا دەلالەتی ئەم کۆکی و نزیکییە دەبێت چی بێت؟!
ئەمە بەڵگەی گەورەیی و دووربینی و ناوازەیی ئەم زانا ناودارە کوردەیە کە ئێمە لە کوردستاندا کەمتر قەدری دەزانین، بەپێی پێویست ئاوڕمان لە ژیاننامە و پەیام و نووسینەکانی نەداوەتەوە. لە کاتێکدا دوور و نزیک، عەرەب و عەجەم، بە پەرۆشن بۆ (وتە) و (مەکتووب) و (بریسکە) و (تیشک)ی بیری پڕ لە سەلیقە و حیکمەتی ئەو کە بەرهەمەکانی نوورسی تا ئێستا وەرگێڕدراوەتە سەر زیاتر لە (چل) زمانی جیهان.
ئەم ڕاستییانە دەمانگەیەننە ئەوەی کە نوورسی هەم ناوازەی زەمان و هەم ناوازەی جیهانە، بۆیە هەنگاوەکان بەو ئاڕاستەیەدا دەڕۆن کە نەتەوە یەکگرتووەکانیش بە نیازەساڵی ٢٠١٥ز بکاتە ساڵی جیهانیی (نوورسی... ناوازەی زەمان و جیهان).

**ئەم وتارە ساڵی ٢٠١٠ بڵاوکراوەتەوە**

# سەعید نوورسی لە زمانی (پیرەمێرد)ەوە

**د. عومەر عەبدولعەزیز**

شاعیر، حەکیم و ڕۆژنامەنووس، حاجی تەوفیق بەگی سلێمانەیی، ناسراو بە (پیرەمێرد)، کوڕی حەمزەئاغای مەسرەف، لەگەڵ شێخ سەعیدی باوکی شێخ مەحمودی حەفید، چووەتە ئەستەنبووڵ و بووە بە میوانی خەلیفەی عوسمانی. لەوێوە سەفەری حەجی کردووە، کە گەڕاوەتەوە بۆ ئەستەنبووڵ، بۆ ماوەی (٢٥) ساڵ لەوێ ماوەتەوە. ساڵی (١٨٩٩) بە فەرمانی سوڵتان عەبدولحەمید کراوە بە ئەندامی ئەنجومەنی باڵای ئەستەنبووڵ، لەبەر لێهاتوویی و وریاییش لە زۆربەی ناوەندەکانی سەردەمی خۆیدا دەرکەوتووە، بۆیە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ زانای گەورەی کوردستان، مامۆستا (سەعید نوورسی)، بووە بە ئەندامی چالاکی (کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققی کورد) و بە خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری ئۆرگانی کۆمەڵەکەش -گۆڤاری (کورد)- هەڵبژێرراوە. هەر لە ئەستەنبووڵ کۆلێژی حقوقی تەواو کردووە و هاوسەرگیریی کردووە. لە سەرێکی ترەوە لەگەڵ نوورسی ئەندامی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی (کۆمەڵەی ئیتیحادی موحەممەدی) بوون. بۆیە لەبەر چالاکی و هەڵوێستی بەرهەڵستکارانەیان، هەردووکیان دەسگیر کراون، پێکەوەش ئازاد کراون. جگە لەوە، پیرەمێرد ئەندامی (کۆمەڵەی زانستیی کوردان)، (کۆمەڵەی کوردستان)، (کۆمەڵەی سەربەخۆیی

کورد) و (کۆمەڵەی هێڤی)یش بووە.١
زانا، نووسەر و بیرمەندی گەورەی کورد و جیهانی ئیسلامییش، بەدیعوززەمان سەعید نوورسی، هەر لە تەمەنی لاویتی و لە شانزە ساڵیدا، ساڵی (١٨٩٢) نازناوی هەڵکەوتووی سەردەم (بدیع الزمان)ی لە لایەن زانایانی ئەو کاتەوە پێ بەخشراوە، ئەمەش پاش گفتوگۆیەکی زانستی کە لە شاری (سعرت) لەگەڵی کراوە. ساڵی (١٩٠٧) چووە شاری ئەستەنبووڵ و ڕای گەیاند کە ئامادەی وەڵامدانەوەی هەموو پرسیارەکانی خەڵکییە. هەمان ساڵ نامەیەکی بۆ سوڵتان عەبدولحەمید نووسی و داوای چاکسازیی لە کوردستان کرد. هەر لەو ساڵەدا بە (پیرەمێرد) ئاشنا بوو. ساڵی (١٩٠٨) لەگەڵ ژمارەیەک لە دۆستانیدا کۆمەڵەی (ئیتیحادی محەممەدی)یان پێک هێنا و هەمان ساڵ بە بۆنەی ڕووداوی (٣١ی مارت)ەوە لەگەڵ (پیرەمێرد) و ژمارەیەکی تر لە ڕووناکبیرانی کورد و تورک دەستگیر کران. نوورسی لەو چەند ساڵەی ئەستەنبووڵدا چەندین وتاری لە گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و تورکییەکاندا بڵاو کردووەتەوە، وەک: (کورد)، (ولقان)، (شەرقی کوردستان)، (سەربەستی)، (سبیل الرشاد) و... لە ژیانیشیدا چەندین جار دادگایی و زیندانی کراوە و دوور خراوەتەوە. لە (١٩٦٠/٣/٢٣) پاش تەمەنێکی موبارەک و خزمەتێکی زۆر و نووسینی دەیان کتێب و نامیلکە کۆچی دوایی کرد.٢

**نوورسی و پیرەمێرد: ئەندامانی ئەنجومەنی بەڕێوەبردنی (ئیتیحادی محەممەدی)**

ئەندامێتیی پیرەمێردی شاعیر لە (ئەنجومەنی بەڕێوەبردن)ی کۆمەڵەی (ئیتیحادی محەممەدی)، لای زۆربەی مێژوونووسان یان پێی نەزانراوە یان فەرامۆش کراوە و بە هەند نەگیراوە. بەڵام باسی ئەندامێتیی نوورسی کراوە، چونکە خۆی باسی کردووە. بەندە کە ئێستا ئەم دێڕانە دەنووسم، دەقی پێڕەوی ناوخۆی (ئیتیحادی محەممەدی)م لەبەر دەستدایە کە ئەو کاتە ناوی (نظامنامە)یان لێ ناوە و لە ژمارەی (٧٥)ی ڕۆژنامەی (ولقان)ی زمانحاڵی کۆمەڵەکەدا، لە ساڵی ١٩٠٩ بڵاو کراوەتەوە، لە کۆتاییەکەیدا ناوی (٢٦) ئەندامەکەی ئەنجومەنی بەڕێوەبردن، بە ناوی (مجلس إدارە) هاتووە، کە لە زنجیرەی هەشتەمدا ناوی مامۆستا نوورسی بەم جۆرە نووسراوە: (بدیع الزمان سعید کوردی ابن میرزا). لە زنجیرەی (٢٥)یشدا ناوی تەوفیق بەگ (پیرەمێرد) بەم جۆرە هاتووە: (مدرسیندن توفیق أفندی).٣
هاودەنگی و هاوهەڵوێستیی نوورسی و پیرەمێرد لە هەڵگرتنی خەمی نەتەوە، خاک و ئوممەتدا وای لێ کردن کە هەردووکیان پێکەوە ببنە ئەندامی ئەنجومەنی ئیدارەی ئیتیحادی محەممەدی کە لە (١٩٠٩/٤/٥)دا، لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی گۆڕەپانی بەردەم مزگەوت و کڵێسای (ئەیاصۆفیا)ی شاری ئەستەنبووڵدا ڕاگەیەنرا. نوورسی وتارێکی گرنگی تێدا خوێندەوە و پشتیوانیی لێ کرد کە خۆی لە ژیاننامەکەیدا بە شانازییەوە باسی ئەو ڕۆژە و ئەو وتارە و ئەو ڕێکخراوە دەکات.٤ کۆمەڵەی ناوبراو بۆ داکۆکیکردن لە ئیسلام و دەستوور و بە نیازی چاکسازی لە سەڵتەنەتی عوسمانیدا دامەزرا. هەندێک پێیان وایە کە نورسی بۆ خۆی دامەزرێنەری ڕێکخراوەی (ئیتیحادی محەممەدی) بووە.٥

**دامەزراندنی (کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققی کورد)٦ و ئەندامێتیی نوورسی و پیرەمێرد**

کاتێک لەژێر فشاری هێزە بەرهەڵستکارەکانی سوڵتان عەبدولحەمیدیدا شۆڕشی دەستووری لە تورکیا سەری گرت، سوڵتان ناچار بوو کە سەرلەنوێ لە (١٩٠٨/٧/٢٣) دەستوور ڕابگەیەنێت – کە بە ڕاگەیاندنی دووەمی (مەشرووتە) ناسراوە و سیستمی حوکمڕانیی بکاتە دەستووری.٧ بۆیە پاش ئەوە کرانەوەیەکی سیاسیی گونجاو ڕووی دا. لەو ساڵەدا کوردانی دانیشتووی شاری ئەستەنبووڵ ڕێکخراوێکیان بە ناوی (کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققی کورد) دامەزراند و شێخ عەبدولقادر شەمزینی بوو بە سەرۆکی.
سەبارەت بە پەیوەندیی نوورسی لەگەڵ ئەو کۆمەڵەیە و هەندێک ڕێکخراوی تر، (ڕۆهات ئەلاکۆم) دەڵێت: «لەو ماوەیەدا کە نوورسی لە ئەستەنبووڵ بوو، تێکەڵییەکی کاریگەری لەگەڵ (کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققی کورد)، (کۆمەڵەی

بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کورد) و (کۆمەڵەی تەعالیی کوردستان) هەبوو. لە لایەکی دیکەوە، ساڵی (١٩٢٠) بوو بە یەکێک لە دامەزرێنەرانی هەیڤی سەوز (یەشیل ئای).٨ لە جێیەکی دیدا دەڵێت: «جێگرتنی سەعیدی کوردی لە نێو دەستەی دامەزرێنەرانی ئەم جەمعییەتەدا (مەبەستی کۆمەڵەی بڵاوکردنەوەی مەعاریفی کوردە)، نیشانەی هاوکاریی ئەو بووە، کۆششەکانی سەعیدی کوردی بۆ سەرهەڵدانی جەماوەری لە دژی دەسەڵاتی عەبدولحەمید -بە بەشداریکردنی لەو جەمعییەتەدا- واتایەکی دیکەیان پەیدا کرد.٩

بە داخەوە، لە زۆربەی ژیاننامەکانی مامۆستا نوورسیدا باسی ئەم ئەندامێتی و جۆرە چالاکییانەی نەکراوە، سەرەڕای ئەوەی زۆربەی سەرچاوە کوردی، عەرەبی و تورکییەکانم خوێندووەتەوە. بۆ خۆشی وتارێکی لە ژمارە شەشی ڕۆژنامەی (کورد) دا نووسیوە، تیایدا ئاماژە بە ڕۆڵی ئیسلام لە بزافی ڕزگاریخوازی کورددا دەکات و جەخت دەکاتەوە لە کۆمەڵەی (تەعاون و تەرەققی کورد) کە پەنا بەرێتە بەر سوودوەرگرتن لە شەریعەتی ئیسلام بۆ ڕێکخستنی سەرلەنوێی کۆمەڵە.١٠

پیرەمێرد، خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری گۆڤاری (کورد) ڕێکخراوی ناوبراو بڕیاری دا ڕۆژنامەیەک بە ناوی (کورد) دەربکات، (پیرەمێرد) یشیان بە هەڵبژاردن وەک خاوەن ئیمتیاز و بەڕێوەبەری ڕۆژنامەکە دەستنیشان کرد، کە بە هەردوو زمانی کوردی و تورکی لە ئەستەنبوڵ دەردەچوو. جگە لەوەش، وەک پێشتر باسمان کرد، یەکێک لە دە ئەندامی یەکەمی دامەزرێنەرانی بووە. لەو کاتەدا نوورسی لە ئەستەنبوڵ دەژیا، لەگەڵ پیرەمێرد هەردووکیان لە خەمی دەستەبەرکردنی مافەکانی میللەتەکەیاندا بوون، بۆیە هەردوولایان بۆ دەرکردنی ڕۆژنامەکەی زمانحاڵی کۆمەڵەی (تەعاون و تەرەققی کورد) -واتە ڕۆژنامەی (کورد)- هاوکاری یەکتر بوون و برادەرییان زۆر گەرموگوڕ بوو.

**دژایەتیی (ئیتیحاد و تەرەققی)ی تورکان بۆ (تەعاون و تەرەققی کورد)**

کاتێک سەرانی (ئیتیحاد و تەرەققی) دەسەڵاتیان کەوتە دەست، لەبەر دژایەتییان بۆ ئیسلام و ئەو دەمارگیرییە تورکچییەتیەش کە هەیانبوو، دەستیان کرد بە سنووردارکردنی ئازادییەکان بە گشتی و چالاکیی کەسایەتییە کوردەکان بە تایبەتی، بۆیە کەوتنە دژایەتیکردنی کۆمەڵەی (تەعاون و تەرەققی کورد) و ڕۆژنامەکەیان، چ لەبەر پشتگیریکردنیان لە ئیسلام وەک ئایینی کۆمەڵگەی کوردستان، چ لەبەر داکۆکیکردنیان لە مافە نەتەوەییەکانی خەڵکی کوردستان.

**سەرەتای یەکترناسینی پیرەمێرد و سەعید نوورسی**

وتارێکی پیرەمێرد سەرەداوی زانیاریی بەسوودمان دەداتێ لەسەر یەکترناسینی یەکەم جاریان، واتە سەرەتای ئاشنابوونی نوورسی و پیرەمێرد بە یەکتر. وا دیارە لە ئەستەنبوڵ قاوەخانەیەکی خوێندنەوەی ڕۆژنامە تایبەت بە کوردەکان هەبووە بە ناوی (قیرائەتخانەی دیاربەکر).١١ پیرەمێرد ڕۆژێک لە ڕۆژنامەکاندا ئەو هەواڵەی بیستووە کە مەلا سەعیدی نوورسی ڕای گەیاندووە: «ئامادەیە لە ماڵەکەی خۆیدا وەڵامی هەموو پرسیارێک بداتەوە.» لەو هەواڵەوە پیرەمێرد خولیای ناسینی نوورسی دەکەوێتە سەری و دەبنە هاوڕێ و هاوکاری چەندین ساڵەی یەکتر.

دواتریش پیرەمێرد پاش دوورکەوتنەوە لە ئەستەنبوڵ و گەڕانەوەی بۆ سلێمانی، سەرەڕای تێپەڕینی دەیان ساڵ، وەک وەفا و پێزانینێک بۆ ئەو دۆستایەتییە خاوێنە، لە چەندین جێی ڕۆژنامە نایابەکەیدا (ڕۆژنامەی ژین) کە لە سلێمانی دەری دەکرد، باسی سەعید نوورسی دەکات، هەندێک لە بیرەوەرییە هاوبەشەکانیان و ناوبەناو بەشێک لە

هەڵوێست و وتە بەنرخەکانی دەگێڕێتەوە. ئەمەی خوارەوە بەشێکە لەو هەوڵانەی پیرەمێردی ڕەحمەتی بۆ زیندووڕاگرتنی یادی مامۆستا نوورسی:

**١- وتاری: (تەئریخ و ئەشخاص، بەدیعوززەمانی کوردیی):**

پیرەمێرد لەژێر ئەو ناونیشانەدا دەڵێت:
«لەئەستەنبوڵ بووم، ئاموشۆی (قیرائەتخانەی دیاربەکر)م ئەکرد. زۆرتر کوردەکان لەوێ دادەنیشتن. ڕۆژێکیان لەغەزەتەدا خوێندمەوەکە: «لە(وان)ەوەمەلا سەعید ناوێک هاتووەلەقەبی (بەدیعوززەمانی کوردی)یە، لە(مەدرەسەی فاتیح) دادەنیشێت. تا حەوت ڕۆژ هەرکەس ئارەزوو بکا لەعیلمدا هەرچی لێ بپرسێت، جوابی

ئەداتەوە.» ئەم ئیعلانەبوو بەجونبوشێک بەژن و بەپیاوەوهەرچی هەڵدەستا ڕووی ئەکردەفاتیح. نیوەیان بۆ پرسیار و نیوەیان بۆ سەیر، ئەچوون. هێجگار ئەوانەی کەئەچوون عەجائیبیان لەوەئەما، کوردێکی هەرەتی کوڕێنی، بەشاڵ و شەپک، چۆغە و ڕانک و پشتێنێکی چیت، دوو سێ جامەدانە و شەدەی گوڵنکەدار بەسەرەوە، قەمەیێک بەلاقەدەوە و سمێڵ بادراو و ڕیشی هەڵپاچراو، لافی مەلایەتی لێ ئەدا.

ڕەفیقێکم بوو یادی بەخێر، (خەلیل خەیاڵی) زۆر خوێندەوار و بەویقار و بەئاپار، هەمیشەبەیەکەوەبووین! پێی گوتم: ئاغا، مەلا سەعیدی بەدیعوززەمان هاتووە، هێشتا تۆ نەچووی بیبینی؟ وتم: کاکە، من و مەلایان نەوتووە. وتی: ئاخر ئەویش وەک تۆ لەمەلایان بێزارە. تەعریفی وا بۆ کردم دەستبەجێ وتم: هەستەبا بڕۆین. وتی: باشە، وا ئێوارەیە، درەنگەئێستا کەسی لەدەور نەمابێ... کەچووین، لەدوور ئێمەی بەچاو کرد. هەستا هات بەپیرمانەوە، بە(خەیاڵی بەگ)ی گوت: یاخوا بەخێر بێی. دیارییەکی قنجت بۆ هێناوم. باوەڕم ئەوەیەئەمە(سلێمانیەلی تۆفیق بەگ)ە! {ناوی پیرەمێردە}. (خەیاڵی)ش وتی: سەییدی! بەچت زانی هەوە؟ وتی: دڵم خەبەری دامێ. هەویش نەبێ، بەو نیەتەدەست ئەکەمەملی. دەستی ڕاستی بەسەر شانمدا هێنا، خستییەپشت شانمەوە، وتی: موصافەحەی کوردان وەسانە.

دانیشتین. لەپاش گفتوگۆیەک، بووینەئاشنا. درێژەی پێ نەدەین، دوایی ئەویان بردەمابەین، ئەهمییەتێکیان پێداو مەعاشیان بۆ تەخصیص کرد. نەیویست و هەندێ قسەی ناشیرینی کردبوو، وتبووی: من بۆ سواڵی مەعاش نەهاتووم، بۆ چارەی میللەتەکەم هاتووم، مەعاریفیان نییە و پادشایش زەکاتی زەمانی سەڵتەنەتی خۆی وەک (عمر عبدالعزیز) صەرف کا. ئەوانیش ناردیانە(تیمارخانە)١٢ و مودیری تیمارخانەکەگفتوگۆی لەگەڵ کردبوو، تێگەیشتبوو، ئیستیعفای کردبوو، وتبووی: ئەگەر ئەم پیاوەشێت بێ، کێ عاقڵە...؟!

ئیتر مەلا سەعید کەوتە گێچەڵەوە، حەپس کراو بەربوو. لەژێر موراقەبەدا بوو تا (مەشرووتییەت)

فریـای کـەوت. چەنـد نوتقـی داو چەنـد مەقالـەی لەغەزەتـەدا نووسـی. درۆ ناکـەم، مەقالـەی غەزەتەکانی، من بۆم ئەنوسییەوە، چونکەئەوڵەن خەتەکـەی نەدەخوێنرایـەوە،١٣ دووهـەم تورکـی تـەواو نەدەزانـی، تـا لەدواییدا فێربوو. ئەنجا ئیلتحاقی (جەمعییەی کوردانی)١٤ کرد، عوزوی فەعـال بـوو. لەوێشـدا دوو کەسـی خۆمـان و یەکێکی کەرکوک دڵـی (سـەید عەبدولقـادر)١٥ یان لێ ئێشان، بەڵام (دار الحكمة الإسلامية)١٦ بردیانەمەجلیسـی خۆیانـەوە، جوابـی سـوئالی ڕاهیبەئینگلیزەکانیـان پـێ دایـەوە. پێنج هـەزار قرۆشـیان دایـێ، ئەویشـی نەویسـت، بەخۆڕایـی ئـەو ئەسەرەنایابەکەئیسکاتی ڕەهبانەکانـی ئینگلیـزی پـێ کـرا، بەعەرەبـی بـۆی نوسـییەوە. لەشـەڕی یۆنانـدا، چـوو لەکوردستانەوەلەشکرێکی زۆری کوردی پێش خۆی دا، بـەدە هـەزار کەسـەوەئیلتیحاقی قیوای میللییـەی کـرد. منیشـی بـەزۆر لەگـەڵ خـۆی بـرد، تـا یۆنـان شـکا.

دوایی لەخصوصی دیانەتەوەلەگەڵ (ئەتاتورک) دەمەقاڵیـان بـوو، تەرکـی دونیـای کـرد. چووەسـەر شـاخی یوشـەع پێغەمبـەر، چل شـەو ڕیازەتـی کێشا. ئاخـری مـن دۆزیمـەوە، بەفێڵ بردم بۆ (ئەرزڕۆم)، لای خالیـد بـەگ ڕەئیسـی (پـورە)ی کوردسـتان، لەوێـش ئیشـتراکی (قۆمیتـە)ی نەکـرد. مایەوەخالیـد بـەگ و سـەید عەبدولقادر و ئـەو گەلەناودارانـەی کوردەبـەدارا کـران و ئەویشـیان نەفـی کـرد لە(بـوردور). چـوار سـاڵ لەمەوپێـش کەچوومەمەعرەزی (ئیزمیـر)، بەخزمەتـی گەیشـتم، ئیتـر فەرامۆشـیم کردبـوو. نـەء، نـەء، بەخوداییکەمـن و ئەوی بەیـەک ناسـیوە، تـا دەمـرم فەرامۆشـی ناکەم و بەیەکەوەیش دەمرین... جـا پێـرێ ئێوارەلەماڵـی جەمیلـی خوشـکەزام بـووم، بێ نەشئەبووم، وتـم: کتێبێکـی

تورکیم بدەرێ، وەختی پێ ڕابوێرم. هـەروا کتێبێکی شـڕی بـۆ هینـام، کەلەوەقتـی خۆیـدا نوسـیویەتەوە و « مصطو»یـش لەژێریدا نووسـیویە: «کـورد و کوردسـتان بویلەپارلاق ناحیەلەرن افتخارو تعالی ایدییور.» ئـەو زاتەئەسـتێرەیەکی گەشـی ئاسـمانی میللەتـی کـوردە، ئەمـەوێ بەرەبەرەئاسـارەکانی تەرجەمەبکەم و لە(ژین)دا بینووسـم. لەسـەر خوا.»١٧

**٢- بەسـەرهاتێکی دانسقەی (نوورسـی) و (پیرەمێرد) لەزینداندا:**

بەپێی پارچەشـیعرێکی ناسـکی خـودی پیرەمێـرد -کـە لێرەدا دەینووسـمەوە- وا دیـارە شـەوێک لـە شـەوەکانی زینداندا، کـە هەردووکیـان -پیرەمێـرد و نوورسـی- بـە خەفەتـی ئاییـن و خـاک و خەڵکـەوە خەویـان لێکەوتووە، (کاک ئەحمەدی شێخ)ی سلێمانی چووەتـە خـەوی سـەعید نوورسـی و مژدەی داوەتـێ کە: ئێوە نامرن و ئەمێنن و ئازاد دەکرێن، داواشـی لـێ دەکات کـە ئـەو هەواڵـە بـدات بـە پیرەمێـردی هاوڕێـی زیندانی!

بـە دڵنیاییـەوە پیرەمێـرد، بـە حوکمـی ئـەوەی گەورەبـووی شـاری سـلێمانییە کـە مەڵبەنـدی کاک ئەحمـەدی شـێخە، جارانـی تـر، لـە زینـدان بووبێـت

یان لە دەرەوەی زیندان، باسی کاک ئەحمەدی شێخی بۆ سەعید نوورسی کردووە و گەورەیی و خواناسی و خەمخۆرییەکانی بۆ گوتووە، بۆیە نوورسی خەوی پێوە بینیوە.
پیرەمێرد لە پێشەکیی کتێبی (مەناقیبی کاک ئەحمەد) دا -کە عەزیز ئەفەندی وەسمان پاشا، ناسراو بە خواجە ئەفەندی، لە وەسفی کاک ئەحمەدی شێخدا لە سالانی سییەکاندا بە زمانی فارسی نوسیویەتی و پیرەمێرد وەری گێڕاوەتە سەر کوردی- ئەم باسەی نوورسی دەکا و دەڵێت: «لە ئەستەنبوڵ لە زەمانی ئیختیلالدا -مەبەستی سەردەمی کودەتای ئیتتیحادییەکانە- لەگەڵ مەلا سەعیدی مەشهور بەبەدیعوزەمان نورسی، لەزیندانی بلوکی بەکرئاغادا حەبس بووین. دەیانویست هەڵمانواسن و پێشیان وتین. لەبێهۆشیدا بووم و هەریەکەمان بەجیا لەئۆدەیەکدا بووین و نۆبەتچیشمان لەبەر دەرگا بوو. مەلا سەعید هات، فەرمووی: مەترسەنامانکوژن. کاک ئەحمەدی شێخ هات (واتە: لەخەومدا)، مژدەی دامێ. ڕاستی فەرموو، بەیانی عەفو کراین.١٨
لە ژمارەیەکی تری (ژین)دا، دەڵێت: «لەسەورە و قۆمیتەی (ئەرزڕۆم)ی کوردانی، لەگەڵ (خالید بەگ) و (یوسف زیا) و دکتۆر کەمالدا، لەخزمەت مەلا سەعیدی بەدیعوزەماندا، ڕەنجم ئەدا و ئیدارەی عورفیی لەئەستەنبوڵ بەئیعدام مەحکومی کردم.»
لەژمارەیەکی تری (ژین)دا شوێنی زیندانەکە دیاری دەکات و دەڵێت: «لەزیندانی ژێرزەمینی (بلوکی بەکر ئاغا) لەئەستەنبول گیرابووم، بیمی خنکاندم هەبوو.»
بەهەرحاڵ، دواتر پاش زیاتر لە (٣٠) ساڵ، پیرەمێردی ڕەحمەتی ئەم یادگاری و بیرەوەرییە بەچێژە لە کۆپلەشیعرێکیدا لە سلێمانی بە زیندوویی دەهێڵێتەوە و لە ژمارە (٨٨٣)ی ڕۆژنامەی (ژین)دا لە ساڵی (١٩٤١) لەژێر سەردێڕی (نەڕەی دێوانە) بڵاوی دەکاتەوە و دەڵێت:

**کاک ئەحمەدەکەی خۆشەویستی خوا!**
**زۆرکەس لەسایەی تۆوەنان ئەخوا**
**لەوانەزیاتر من تۆم خۆش ئەوێ**
**هەر تۆی سەربەرزی قەومەکەت ئەوێ**
**کەلەزیندانیان تێک خزاندبووین**
**سێدارەیان بۆ داچەقاندبووین**
**تۆ چوبوویتەلای (بەدیعوززەمان)**
**مژدەت دابوویێ بەژیانو مان**
**فەرموبووت: ئێوەنامرن، ئەمێنن**
**تا سەر ئازادیی گەلتان ئەسێنن**
**خۆ من باوەڕم بەوەکردووە**
**بەوەصیەت ناوی ئێوەم بردووە**
**بەلام وا ئەمرم بەو ئاواتەوە**
**بشمرم گۆڕم دەنگ ئەداتەوە١٩**

جارێکی تریش لە ژمارەیەکی (ژین)ی ساڵی (١٩٤٤) باسی ئەو خەو و هەواڵەی نوورسی دەگێڕێتەوە، بەڵام ئەم جارەیان وەک نموونەی یەکێک لە کەرامەتەکانی نوورسی دەیورووژێنێت، گوایە وا دەردەخا لە کاتی منداڵیدا شتی زۆری بیستووە بە ناوی کەرامەتەوە، کاتێکیش چووەتە ئەستەنبوڵ، پێکەنینی بە خۆی هاتووە کە چۆن کاتی خۆی بڕوای بەوە کردووە کە قاپقاپ لە بەغدا بهاوێژرێت، لە هیندستان سەر بپەڕێنێ! پیرەمێرد دەیەوێ بڵێت: نە ئەو سادەیی و خۆشباوەڕییەی سەردەمی منداڵی تەواو بوو، نە ئەوەش کە بە ڕەهایی هەموو شتێک ئینکار بکرێت. بۆیە حاڵەتێکی مامناوەندیی پێ ڕاسترە و وا دەردەخات کە کاک ئەحمەدی شێخ خاوەنی کەرامات بووە. بۆیە دەڵێت: «تا لەدواییدا بەخزمەت مەلا سەعیدی بەدیعوززەمان گەیشتم، لەکاتی ئیعدامدا مەلا سەعید هات، فەرمووی: ناشێتبتانخنکێنن و ڕاستیشی کرد. ڕزگار بووین. ئەنجا بەو کەرامەتەی کاک ئەحمەد هاتمەوەسەر ڕێی پێشوو. من خۆم کەراماتی کاک ئەحمەدم دیبوو.»٢٠

### ٣- وتاری (ترس و واهیمە):

پیرەمێردی شاعیر لەژێر ئەو ناونیشانەشدا ئەم بابەتەی خوارەوەی نووسیوە کە تێیدا ئاماژە بە ئازایەتی و نەبەردییەکانی نوورسی و شوێنکەوتوانی دەکات:
«ولاخی ڕەسەن هونەری لەدرێژیی و سەڵەفدا دەردەکەوێت. بەڵێ: ئەگەر تورکیا لەناوا نەبێتلەملاوەترسمان ڕێدەکەوێت. بەلام من خۆم

پەروەردەی ناو تورکم و لەشەڕی یۆناندا بووم. سێصەد هەزار جەنگاوەری یۆنان بەزەخیرە و موهیماتی تەواوەوە، بەجلوبەرگی تازە و ئەسلەحەی مومتازەوەهاتنەسەریان، گاپوڕی ژنانی ئەنادۆڵی لەقۆماندەی (قەرەئایشەی بیکباشی) و (صاڕی ئامینە)دا بەرەنگاریان بوون. خوا دەیزانێدرۆی تیا نییە، ئەو لاوانەی کە(مەلا سەعیدی بەدیعوززەمان) لەکوردستانەوەهێنابوونی، وەک کارئاسک گومەتەیان ئەبەست و وەک سوێسکەهەڵدەقوڵین، هێشوویان لەپشت ژنەتورکەکانەوەنەدەکرد. ئەو ئافرەتەنازەنینانەخۆیان لەشەڵوار و چاکەت هەڵکێشابوو لوولەتفەنگیان ئەگرت و بەگوڵبانگی (اللە اکبر)ەوەهوجومیان دەکرد. من خۆم لەغیرەتی ئەوان جۆشی گریانم ئەهات.
جا ئەو میللەتەچۆن لەشەڕدا ئەشکێن و تورک کەخۆی نایەپێناوی ئەڵمانەوە، ئەوان بەچ ڕوویکەوەڕوبەڕوویان ئەوەستن؟ لەبەر ئەوەخوا یار بێ هیچ ترس و دەغدەغەییکیان نابێت و ئەم جەژنەیش بەخۆشی ئەبەینەسەر. هەرچی گوێلەم پیرەدنیادیدەئەکا، نەترسێ، نەترسێ.»٢١

**٤- وتاری (زەکا و حافظە):**

هەروەها پیرەمێرد، لەژێر ناونیشانی (زەکا و حافیزە) دا بابەتێکی تایبەت کردووە بە باسی زیرەکی و بیرتیژیی نائاسایی مامۆستا سەعید نوورسی و بەراوردێک دەکات لە نێوان زیرەکیی نوورسی و مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ. ئەمە دەقەکەیەتی:
«بەتێگەیشتن و بەراوردی خۆم، وایەزانم ئەو کەسانەی کەلەخوێندەواریدا ناو دەرئەکەن و هونەر دەنوێنن، بەدوو چشتە: یەکێکیان: زیرەکییە، کەگەوهەری سروشتیان ئەمەندەتیژ و بەڕشتە هەرچی هاتەپێش، ئەیقڵیشێتەوە، پێستی لێفرێئەدا و لەمەغزەکەی ئەکا. دووەمیان لەوەبەکارتر: یادداشت و قووەی حافیزەیە. (مەلا سەعیدی بەدیعوززەمان)ی مەشهور، خوا بیهێڵێ، ئەیگوت: من لەخوێندن، خۆم بینیم، کەللەم لەڕاستی مێشکم هەزار ڕەفەی کون کون و شای هەنگی هەیە. هەرچی ئەیخوێنم و بۆم پوخت ئەبێت، لەو ڕەفانەدا جێگیر ئەبێت. وەک عەتارێکی ماهیر کەداوای دەرمانێکیان لێکرد، دەستبەجێدەستی پڕ ڕادێڵێ و ئەیدا بەدەستەوە. منیش ئەو ماددەیەی کەلەمێشکمدا، یەعنی لەحوجەیراتی دەماغییەدا دامناوە، ئەیدەم بەزبانم، ئەویش بەڕێوجێئەیگێڕێتەوە(!).
باوەڕم کرد کە(مەلا سەعید) ڕاست دەکات. خوا بەهرەیەکی وای داوەتێ کەهاتەئەستەنبوڵ و بەغەزەتەجارێنووسیی: تا حەوت ڕۆژ هەرکەس لەعیلم و فەن پرسیارم لێ دەکات، جوابی دەدەمەوە، زۆر خوێندەوارانی ناودار دەستەدەستەدەهاتن، لێیاندەپرسییەوە، خوا شەرمەزاری نەکرد و ناوی دەرکرد.
ئەنجا خواپێداو کەزیرەک بێ و تێبگا و ئەویش تێی دەگا، لەمێشکیدا هەڵیگرێ و لەگەڵ پرسیانەوە، بتوانیبیخاتەمەیدان، پایەی زۆر بڵند دەبێت، بەشەرتێک گزو گزیریی تێکەڵ نەکا.
ئەمەم بۆیەکرد بەدیباچە، کەلەناو ئێمەیشدا یەکێکی تری وەک بەدیعوززەمانی کوردی هەیە، ئەگەر زەمان زمانی نەبەستێت، خوا یار بێت، لەو باشتر دەبێت. شێخ محەممەدی نەوەی خاڵ زۆرجار کە دووانددومە، دەماغی ئەویشم بە هەزار ڕەفە زانیوە، چشتی وای لێ هێناوەتەدەرێ، مەگەر لە(مەلا سەعید)م دیبێ، خوا بیپارێزێ و سەخڵەتیی بۆ نەیەتەپێش، ناودارێک دەبێت، لەناودارانی پێش باشتر دەبێت.»٢٢

**٥- هەندێ وانەی مەلا سەعید بەدیعوززەمان:**

هەروەها لەژێر ئەو ناونیشانەی سەرەوەدا پیرەمێرد بروسکەوتارێکی (نوورسی)ی، کە ئاراستەی گەلی کوردستانی کردووە، بڵاو کردووەتەوە، ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:
«ئەی گەلی کورد! لەبیرتان نەچێتەوە کە ئێوە دلاوەرە پێشدارەکانی کوردان و شێری بێشەی

ئارییانن، بەڵام خەوی گێژ و نوستنی درێژی ئێوە، لە خەوی عوزێر تێپەڕیوە، ئەو، سەدساڵ نووست، ئێوەسێسەد ساڵەلەخەودان.!

ئەموستی عیززەتی خوا لەگۆشەی ئوفوقی ئەزەلەوەئیشارەتی ئێوەدەکات و بەهەڕەشەوە دەڵێت: سەرچاوەی کورد لەسەر شاخی فیترەتی بەرزە، وەک تاڤگە و شەللالە، هەڵدەڕژێتەخوارەوە، بۆیەوا بەپەرش و بڵاوی هیچ تنۆکێکی بەیەکەوەنانوسێت، بەڵام لەخوارەوەکەگەیشتەحەزیز (حضیض)ی پەستی، هەموو باخەوانێک جۆگای لێهەڵدەبەستێت، دەیبات بۆ خۆی، دەینێتلەباغچە، قووەتی کەم دەکاتەوە، هیچ فائیدەیەکی بۆ سەرچاوە و شوێن و مەڵبەندی خۆی نییە. یاخۆ زەرراتێکن شوێن جازیبەی ڕۆژی شەوکەتی لاوەدەکەون، لەجازیبەی میللی بێزارن، ڕادەکەن، هەمیشەتەفرەقەجوون.»٢٣ پیرەمێرد بەم جۆرە باسی نوورسی دەکات. بە داخەوە، ئەوەندەی من ئاگادار بم، مامۆستا نوورسی لە هیچ کام لە کتێبەکانیدا کە پاش ناسینی پیرەمێرد -واتە لە ساڵانی ١٩٠٥ بەدواوە نووسیونی- کە دەکەنە زۆربەی هەرە زۆری پەیام و نووسینەکانی- هیچ باسێکی پیرەمێردی ڕەحمەتی ناکات، لە کاتێکدا ناوی هەندێک لە قوتابی و هاوەڵانی دەبات، لەوانە: خەلیل خەیاڵی موتکی، یەکەمین نووسەری ئەلفبێی کوردی، یوسف زیا پاشا، عەبدوڕەحمانی برازای و حەمزە موکسی... بەڵام پیرەمێرد -بە پێچەوانەوە لە چەندین شوێنی نووسینەکانی (ژین)ی خۆی و هەندێ جێی تریشدا، وەک بینیمان، باسی سەعید نوورسی دەکات، چ سەرەتای ناسینی، چ کاتی خەبات و هەوڵی سیاسی و خزمەتکردنیان بە ڕۆژنامەگەریی کوردی و خزمەتی کوردزمانانی دانیشتووی ئەستەنبووڵ، چ کاتی دەسگیرکران و زیندانیکردنیان پێکەوە.

بەشێک لە پەیامەکانی نوور

زللەی میهرەبانی

بەدیعوززەمان

سەعیدی نوورسی

داینەوە

فاررووق ڕەسووڵ یەحیا

کردوویە بە کوردی

**پەراوێز و ژێدەرەکان:**

١- بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ژیاننامەی پیرەمێرد، بڕوانە: پیرەمێردی نەمر، محەممەد ڕەسوڵ هاوار، بەغدا، ١٩٧٠ و یادی پیرەمێرد، عەلادین سەجادی و ڕۆژنامەکانی (ژین) و (ژیان).

٢- بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ژیاننامەی نوورسی، بڕوانە: (السیرة الذاتیة)ی نووسینی خۆی کە لە لایەن (إحسان صالحی)یەوە کراوە بە عەرەبی. هەروەها سایتی (نافذة النور) کە تایبەتە بە ژیاننامە و بەرهەمەکانی.

٣- السیرة الذاتیة، سعید النورسی، ترجمة: إحسان قاسم الصالحی، ص:١١١.

٤- بڕوانە: من الفكر والقلب، سعید رمضان البوطی، دمشق، ١٩٦٩، ص: ٢٧٢.

٥- بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ئەم ڕێکخراوە، بڕوانە: کۆمەڵەی تەعاون و تەرەققی کورد، مالمیسانژ، و: زریان ڕۆژهەڵاتی، لا: ٣٦-٣٨.

٦- مەبەست لە (مەشرووتییەت) ڕاگەیاندنی دەستووری عوسمانییە، لە تەمووزی ١٩٠٨دا، کە هەڵبژاردن و پێکهێنانی ئەنجومەنی نوێنەران (مجلس مبعوثان)ی بەدوادا هات، لەو کاتەدا پیرەمێرد و نوورسی و ژمارەیەک لە کوردانی ڕووناکبیر لە ئەستەنبووڵ دەژیان.

٧- کوردەکانی ئەستەنبووڵی کۆن، نووسینی: ڕۆهات ئەلاکۆم، وەرگێڕانی: ئەحمەد تاقانە، ٢٠٠٥، هەولێر، لا: ٩٣.

٨- جەمعییەتی تەعالیی کوردستان، ئیسماعیل

گوێڵداش، لا: ٤٦.
٩- گۆڤاری ڕۆژنامەوان، ژمارە: ٩، لا: ٦٨. جەبار قادر لە سەرچاوەکەی جەلیلی جەلیل وەری گرتووە.
١٠- قیرائەتخانە: واتە شوێنی خوێندنەوە. جاران لە سەردەمی عوسمانییەکاندا لەبەر کەمیی کتێب و ڕۆژنامە، لە هەندێ شوێنی گشتی و سەنتەری شارەکاندا بەشێک لە چاپخانەکان بڵاوکراوەکانیان دادەنا و ئارەزوومەندانی خوێندنەوە دەچوونە ئەو شوێنانە بۆ وەرگرتنی زانیاری و هەواڵە گەرماوگەرمەکان.
١١- مەبەست لە تیمارخانە شوێنی (چاکسازیی کۆمەڵایەتی)یە، ئەو شوێنەی کە نەخۆشانی بیرکۆڵ و دەروونییان تێدا کۆ دەکردەوە، جاران لە کوردەواریدا دەستەواژەی (شێتخانە)ی بۆ بەکار دەبرا.
١٢- خەتی نوورسی زۆر ناخۆش بووە، تا ڕادەیەک کە نەخوێنراوەتەوە. بۆیە خۆی بە نووسینەوە خەریک نەکردووە و زۆربەی بەرهەم و پەیامەکانی لە لایەن خۆیەوە ئیملا کراون و هاوڕێ و قوتابییەکانی نووسیویانەتەوە. بڕوانە: پاشکۆی ئەم بابەتە بۆ بینینی نموونەی خەتی نوورسی.
١٣- مەبەستی کۆمەڵەی (تەعاون و تەرەققی کورد)ە کە ساڵی ١٩٠٩ لە ئەستەنبووڵ لەسەر دەستی ژمارەیەک لە ڕووناکبیرانی کوردی نیشتەجێی ئەستەنبووڵ دامەزرا.
١٤- مەبەستی شێخ عەبدولقادری کوڕی شێخ عوبێدوڵا شەمزینییە.
١٥. دار الحكمة الإسلامية: دەزگایەک بوو کە دامەزراوەی باڵای زانایانی دەوڵەتی عوسمانی دایمەزراندبوو بۆ گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوە لەگەڵ پیتۆڵ و زانایانی ئەورووپی و گەیاندنی ئیسلام پێیان. کاتێک نوورسی لە (١٩١٨) لە دیلێتی، لە سیبریا گەڕایەوە، بەبێ ئاگادارکردنی خۆی، کردیانە ئەندامی ئەو دامەزراوەیە. چەندین جار داوای وازهێنانی کرد، قبوڵیان نەدەکرد، بۆیە دواتر بە ناچاری بەشداریی کۆبوونەوەکانی دەکرد. (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئەم سێ کتێبەی خودی نوورسی: الشعاعات، ل: ٥١٥، اللمعات، ل: ٣٧٤، السيرة الذاتية، ل: ١٣٣.
١٦- ئەم وتارەی پیرەمێرد لە لاپەڕە (٢-٣)ی، ژمارە (٦٦١)ی، ساڵی ١٩٤٢ی ڕۆژنامەی (ژین)دا، بڵاو کراوەتەوە.
١٧- مەناقیبی کاک ئەحمەد، نووسینی: خواجە ئەفەندی، وەرگێڕانی: پیرەمێرد، سلێمانی، چاپخانەی ژیان، ١٣٥٨ک/١٩٣٩ز، لا: ٩.
١٨- پارچەشیعری: نەڕەی دێوانە، کە لە ڕۆژنامەی (ژین)، لە ساڵی (١٩٤١)دا بڵاوی کردووەتەوە.
١٩- ڕۆژنامەی ژین، ژمارە ٧٣٩، ساڵی ١٧، ١٩٤٤/٤/٢٠، لا: ٤.
٢١- ڕۆژنامەی (ژین)، ژمارە (٦٠٩)، ساڵی ١٥، پێنجشەممە، (١٩/ ١٠/ ١٩٤٠).
٢٢- ڕۆژنامەی ژین، پێنجشەممە، ١٩٤٠/١١/١٥.
٢٣- ڕۆژنامەی ژین، ژمارە ٦٦٤، پێنجشەممە، ٤/٢٢/ ١٩٤٢.

سەعیدی نوورسی

# سەعید نوورسی وەك ئەدیب

## ئەدەب و شیعرییەت لە (پەیامەکانی نوور)دا

**نەبەز هەورامی**

سەعیدی نوورسی کە زانایەکی عاریفی ناوداری دنیای ئیسلامەتییە، لە هەمان کاتدا ئەدیبێکی گەورەش بووە، پەیامەکانی بە ڕەنگی زمانی ئەدەب و جوانکاریی شیعرییەت نەخشێنراون.
بە داخەوە، ئەم ڕووبەرەی ژیان و بەرهەمیشی، هێندەی من ئاگادار بم، بە زمانی کوردی نەبووە بە جێگەی باس، لە کاتێکدا بە زمانانی دی کاری باشی بۆ کراوە.١
(د. محمد حکیب) دەڵێ: «نوورسی لە هەموو ئەوەدا کە نووسیویەتی، ئەدیب بووە و بۆنی ئەدەب و بەرامەی جوانکاریی لێ پەرش دەبێ.٢
ئیحسان قاسم ساڵحی، وەرگێڕی بەرهەم و داستانی ژیانی نوورسی بۆ زمانی عەرەبی، دەڵێ: «خوێنەر لە ڕەوانبێژییەکی بەرزدا، بە مانا و مەبەستی (پەیامەکانی نوور) دەگات...» بە جۆرێک، وا دەزانێ شیعرێکی ناسک، یان ئەدەبێکی باڵا موتاڵا دەکات، چونکە خەیاڵێکی پاراو و پەسنێکی داهێنەرانەیان تێدایە.٣
ئەدیب ئیبراهیم دەباغ دەنووسێ: «نوورسی لە (مەسنەویی نووری) و لە پرسە ئیمانییەکاندا ئاوێتەیەکە لە عەقڵی بیریار و دڵی شاعیر. (مەسنەوی) لە فۆرمدا بنەمای پەخشانی هەیە، بەڵام بە ڕۆح و دەروونێکی شاعیرانە و ناسکبینییەک لە وێنە و خەیاڵدا نووسراوە، وێڕای قووڵایی بیر و وردیی مانا.٤

هەروەها دەڵێ: «شتێک کە لە سیحر دەچێ، لە قەڵەمی نوورسیدایە، بەڵام سیحر نییە، بەڵکو نهێنییەکی خودایییە.»٥

شتێکی نامۆ نییە کە نوورسی، ئەدیب یا خاوەنی ڕۆحێکی شاعیرانە و سیحری شیعرییەت بووبێ، چونکە ئەو فەزا عیرفانییەی ئەو تێیدا نوقمی ڕامان و خەڵوەتی پڕ شەوق بووە، ئەو قودرەتە خاریقەی کە لە خەیاڵکردندا هەیبووە، زەمینەی بۆ شیعرییەت و زمانی ئەدەب لە پەیامەکانیدا سازاندووە.

ئەو کە لە کایەی (زانستەکان)دا (بدیع الزمان) بووە؛ لە شێوازی نووسینیشدا داهێنەر (بەدیع) بووە، نووسینی ئەدەبییانە هەر خۆی پرۆسەیەکی ئیبداعییە.

زۆر لە عاریفان و گەورەپیاوان، خاوەنی (پەیام و نامە و مەکتووبات) بوون. نوورسییش بە بیرکردنەوەیەکی وردەوە ناوی (پەیام)ی لە بەرهەمەکانی ناوە.

پەیام خوێنەر دەخاتە ڕامان و پرسیارکردن، دارڕژانیشی شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، کاریگەرییشی زێتر لە هەست و ڕۆح و دڵدا ڕەنگ دەداتەوە.

پەیامەکانی ئەو لە فۆرمەکانی دیکەی نووسین جیاوازن، لێکۆڵینەوە و بەرهەمی کەڵەکەکردنی زانیارییەکی بێگیان نین، بەڵکو گەیەنەری مەعریفە و جۆرە فیکرێکن کە زێتر لە ئیلهام و (کەشف و شهود)ەوەیە... «لە گەشتی ژێرزەمینیدا، مەعنەوییەت و لە ناخیشمدا زۆرم حەقیقەت دیتن.»٦

(نوور)یش کە خراوەتە پاڵ پەیامەکانی، مەدلوولی خۆیی هەیە، بە تایبەت نوورێک لە (پەیامی قورئان)ەوە بێ کە سەرچاوەیەکی گەورەی ڕۆشنایی و مەعریفە و ئەدەبە. ئەمەش تایبەتمەندییەکی ئەدەبی بە پەیامەکان دەدات، چونکە بەشێکی گەورە لە وەزیفەی شیعر و ئەدەب، (وەک نوور) ڕۆشنکردنەوە و (کەشف)کردنی نەبینراو و نەزانراوە.

**کات و شوێن و حاڵەتی ئیلهام:**

پەیامەکانی نوور بەرهەمی خەڵوەت و ڕامانی قووڵن، خەڵوەت لە باوەشی سروشتدا و ڕامان لە ئایەتەکانی کتێبی گەردوون و کتێبی قورئان، خەڵوەت بۆ ڕاز و نیاز لەگەڵ خالیقدا، خەڵوەتێک کە (ئیغتیراب و مەنفا و حوزن) بەشدارن لە دروستکردنیدا.

نوورسی لە دەستپێکی بەشێک لە پەیامەکانیدا، ئاماژەی بۆ کات و شوێن و حاڵەتی نووسینیان کردووە؛ لە سەرەتای (نامەیەک گوفتاری ئەستێرەکان دەردەبڕێت) دەڵێ: «جارێکیان لە سەر لوتکەیەک لە لوتکەکانی (چیای چام)ەوە و لە ئارامیی شەودا سەیری ڕووی گەشی ئاسمانم دەکرد، کتوپڕ ئەم بڕگانەی خوارەوە بۆ دڵم هاتن، وەک بڵێی ئەندێشەم گوێی لەو گوفتارانە بووبێت کە ئەستێرەکان بە زمانی حاڵ دەریان دەبڕی.٧

هەروەها دەڵێ: «بە یەکجاری ڕووم لە دنیا وەرگێڕاوە، بە تەنیایی و گۆشەگیریی بەردەوام لە موجاهەدەی ڕۆحیدام. قەدەرەکان دووچاری (مەنفا) یان کردم، ئا لەم کاتانەشدا، لە ناخی دڵمەوە، مانای درەوشاوە لە فەیز و ڕێژنەی قورئانەوە لەدایک بوون، ناوی (پەیامەکانی نوور)م لێ نان، هەر بە ڕاستی ئەوان لە نووری قورئانەوە دارڕژاون.٨

هەموو ئەمانەش سازێنەری کەشوهەوای خولقاندنی شیعرییەت و دەقی ئەدەبین و لە ژیانی زۆربەی گەورە شاعیرانیشدا هەبوون.

دەتوانین بڵێین شاعیر لە حوزن و ئیغتیرابێکی هەمیشەییدایە، چونکە ژیانی خووپێوەگیراو ژیانی ئەو نییە.

حوزن و غوربەت لای نوورسی، هەڵقوڵاوی دنیابینیی عاریفانەیە، لای سۆفییان و عاریفان، دنیا فیراقە لە مەنزڵی سەرەتای ژیان و دراوسێیەتیی فریشتەکان، ئەمەش شەوق و تەژنەیی بۆ گەیشتنەوە بە مەقامی (قورب)ی ئیلاهی، دەخوڵقێنێ.

«دوو سێ مانگە لەم چیا چۆڵانەدا کە غەریبیم بە یاددا دەهێنن، بە تەنها ماومەتەوە، کاتێ شەو پەردەی خۆیم بەسەردا دەدات، لە نێوان پێنج

جۆری غەریبیدا خۆم دەبینمەوە...» بازنەی هەر جۆرە حوزن و غوربەتێکیان بازنەیەکی دیکەی فراوانتری بەدوای خۆیدا هێناوە...

«لا اريد... من كان زائلا لا اريد
انا فان... من كان فانيا لا اريد
انا عاجز... من كان عاجزا لا اريد
سلمت روحي للرحمن، سواه لا اريد
بل اريد...حبيبا باقيا اريد
انا ذرة ، شمسا سرمدا اريد
انا لاشيء و من غير شيء، الموجودات كلها اريد»

«نوورسی، بۆ باسکردن لە ئیغتیراب و مەنفا، خاوەنی شێوازێکی شیعرییانەی زۆر بەهێز بووە، ئەو لەژێر قەساوەتی کەنارگیریدا خولقاوەتەوە، لە قوولاییەکانی حوزنیشدا بە لوتکەکانی داهێنان گەیشتووە.»

دەبێ ئەوەش بڵێین حوزنی نوورسی «حوزنێکی ئینسانییشە بەرانبەر بە نالەبارییەکانی ژیان. بۆ ئەمەش، داوای گرتنەبەری ڕێگەی ژیانی نوێ و گەیشتن بە سایەی دادپەروەری دەکات.»٩

**زمان:**

ئەو فەزایەی کە ئاماژەمان بۆ کرد، وێرای مانای بەرز، بووە بە خولقێنەری زمانێکی شیعرییش، بە تایبەت موناجاتەکانی، بە تایبەتتر (مەسنەوی) یەکەی، تەنانەت هەر خۆی کۆشاوە بە شیعر هێندێکیان بنووسێ.١٠

سبحان من يحمده:
الضياء بالانوار... و الماء و الهواء بالانهار و الاعصار
والتراب و النبات بالاحجار و الازهار
والجو و الاشجار بالاطيار و الاثمار
و السحب و السماء بالامطار و الاقمار......
(دەقەکە درێژە.)

لە سەرەتای ئەم موناجاتەدا دەڵێ: «لە هێندێکیدا، ئاوەها سەمای جەزبەم بە جۆرێک لە وەزن دەرخستووە، کە لە شیعر دەچێ، بەڵام شیعر نییە، بەڵکو قافیەی زیکرە لە جەزبەی فیکردا.» واتە هەوڵی داوە بزاوتی ئەو مەخلوقانە بکات بە ئیقاع و مۆسیقای دەقەکە، ئەم ئاوێتەکردنەش لە کاری ئەدەبیدا بە هەموو کەس ناکرێ.

«٢٥ ساڵ پێش ئێستا، قەسیدەی (الاسماء الحسنى)ی (شێخی گەیلانی - قدس سره)م خوێندەوە، حەزم کرد موناجاتێکی هاوچەشنی ئەوەی ئەو بە ناوە جوانەکانی خودا بنووسم، بەڵام لەبەر ئەوەی لە بەهرەی هۆنین بێبەشم، هەر ئەم ئەندازەیەم بۆ نووسرا و بە داخەوە نەمتوانی تەواوی بکەم.»

ئەو (نامە)یەشی کە لە پێشەوە سەرەتاکەیمان نووسی، نموونەیەکی دیکەیە لە نووسینێک کە زۆر لە شیعر نزیک بووەتەوە... «لەبەر نەشارەزاییم لە ڕێسا و دەستوورەکانی شیعر، ئەو واتایانەم چۆن بە دڵدا هات، هەر وەهاش نووسیمنەوە، بەبێ ئەوەی بتوانم لەسەر کێشی شیعر و هۆنین ڕێکیان بخەم.١١

هەروەها لە زۆر شوێندا شیعری شاعیرانی

ئاوێتەی هەناسەی پەیامەکانی کردووە، بە تایبەت: مەولانای ڕۆمی، شێخی گەیلانی، مەلای جزیری، جامی، سەعدی و حافیزی شیرازی و...

**جوانکاری:**

بەشێکی گەورە لە وەزیفەی ئەدەب و شیعر، ئیستاتیکی و دەرخستنی جوانیی و گەیاندنی چێژە. خوێنەری پەیامەکانی نووریش زۆر جار وا هەست دەکات نوقمی دنیایەکە پڕ لە جوانی یان لە بەردەم تابلۆیەکی هونەریی بەرزدا وەستاوە.١٢ چونکە ئەو، لە باسی مەلەکووتدا، لە ستایشی جێگەدەستەکانی خودا لە سروشت و جیهانی ناسووتدا، لە ڕۆشناییەکانی قورئان و نبووئەتدا بەردەوام جیلوەی جەماڵ و جەوهەری کەماڵی دەرخستووە.

**ڕەمزیەت:**

ڕەمز لە ئەدەب و شیعردا بە گشتی و لە دەقی سۆفییانەدا بە تایبەتی ئامادەییەکی بەرچاوی هەیە، ئەو دنیایەی کە شاعیر و عاریف تێیدا دەژین، زمانەکەی جیاوازە، زمانی قسەکردن و فەرهەنگ بە تەنها ناتوانێ لە ئاست دەربڕینی خەیاڵ و حاڵ و مەقامات و عروجی سۆفییانەدا بێ و بە هانای وەجد و دیهەشت و سووتان و تینوێتیی ڕۆحەوە بچێ، ئاسان نییە بە زمانی ناسووت قسە لە جیهانی مەلەکووت بکرێ.

(نوور، خۆر، ئاوێنە، بولبول، تاوس و باڵندە و گیانلەبەرانی دی، ڕەمزەکانی نێو دنیای داستانە عیشقییەکان) لەوانەن کە لای نوورسی بە فراوانی تەوزیف کراون. (بولبول و گوڵ) یەکێکە لە دەقە ڕەمزییەکانی، سەرچاوەکەشی ئەفسانەیەکی عیشقییە.

ئەم داستانە و چەندان ڕەمزی دیکەش، لە لای

شاعیرانی عاریف (بە تایبەت مەولانای ڕۆمی و ئیقباڵی لاهوری)ش تەوزیف کراون.١٣

**خەیاڵ:**

ڕەگەزی خەیاڵ لە ئەدەب و لە شیعردا، ڕەگەزێکی سەرەکی و سەنتەرییە، دەتوانم بڵێم ڕەگەزەکانی دیکەش، بەشێک لە زیندوێتیی خۆیان لە زیندوێتیی خەیاڵی خاوەن دەقەوە وەردەگرن.١٤ لە دیدی نوورسییەوە نەک هەر لای شاعیر، بەڵکو «خەیاڵ فراوانترین هەستی مرۆڤە بە گشتی.١٥ لە کاتی موتالای پەیامەکانی نووردا، خەیاڵێکی بەرز و فراوان باڵ بەسەر زەین و خەیاڵی خوێنەردا دەکێشێ و بەرەو فراوانی دەیبات.

**گێڕانەوە:**

گێڕانەوە لە ئەدەبدا ئامادەیی بەرچاوی هەیە، داستانە کۆنەکان کە دەقێکی بە شیعر داڕێژراون، گێڕانەوەن. قورئانی پیرۆز سەرچاوەیەکی گەورەی گێڕانەوەیە، ڕووبەرێکی زۆر لە (مەسنەویی مەعنەوی/ڕۆمی) گێڕانەوەیە بە زمانی شیعر و ئەدەب. نوورسییش بایەخێکی گەورەی بە گێڕانەوە و (مثل) داوە. لە کۆی پەیامەکانیدا، نزیکەی (٥٠٠) گێڕانەوە هەن کە بەشێکیان لە ڕەمزیەتێکی چڕدان.١٦ لەمەشدا

بەهرەی لە قورئان بردووە و خۆی بە ستایشەوە باسی کردووە.١٧

**کەشف و شهود:**

«جیهان نوقمی نهێنییە، بەڵام نهێنییەکان بە پەردەی نەریت و هۆگری داپۆشراون، کاری ئەدیب لادانی پەردەکان و چوونەنێو قووڵایی شتەکان و دەرخستنیانە.١٨ زۆر جار لەبارەی وەزیفەی شیعرەوە گوتراوە «بینینی نەبینراوەکان و بیستنی نەبیستراوەکانە» یان: کەشفکردنە.١٩ لە دیدی نوورسییەوە، نەک هەر شاعیر و ئەدیب، بەڵکو «مرۆڤ بە گشتی بۆ وەزیفەی کەشفکردن خولقاوە، مرۆڤ خۆی وێنەیەکی نوورانی و ئاوێنەی تیشکدانەوەی جیلوەی جەماڵی ئەزەلییە.»٢٠

تەنانەت لە دنیابینیی سۆفییانەدا تەواوی وجود لەپێناو یەک حەقیقەتی مەزندا بەدی هێنراوە کە کەشفی جیلوەی نووری خودایە.

پەیامەکانی نوورسییش، نوورن بۆ لادانی پەردەی سەر نهێنییەکانی بوون و مرۆڤ، ڕۆشنایین بۆ کەشفی جیهانی باڵا و مەلەکووت، بۆ ئەوەی بەبێ ڕامان و دۆزینەوەی ڕۆشنایی حیکمەت بە لای هیچ دیاردەیەکی وجوددا گوزەر نەکرێ.

**دنیابینی:**

یەکێک لە وەزیفەکانی شیعر لە ڕوانگەی بەشێک لە شاعیران و ڕەخنەگرانی ئەدەبەوە خوڵقاندنی دنیابینیی جیاوازە.

واتە دەبێ لە شیعردا شتەکان ناو و ڕۆڵ و مانای نوێیان پێ بدرێتەوە، بە تایبەت مانا بە ڕوانین، کە دەبێ ڕوانینێکی پڕ لە پرسیار و سەرسامی و ڕازئامێز بێ، ئەمەش دەبێت بە خوڵقێنەری زمان و فۆرمێکی تایبەت.

لە ڕوانینی سۆفییانەشدا ئەمە خاڵێکی جەوهەرییە، تەنانەت زاتی خودا لە لای ئەوان، خودای بۆچوونە زانستی و کەلامییە وشکەکان نییە.

لای نوورسییش دنیابینییەک ئامادەیی هەیە کە نە دنیابینییە دینییە نەریتییەکەیە، نە ئەوەشە کە جیهانی بەرچاو بە سەرچاوەی هەموو شتێک دەزانێت و غەیبانیەت وەلا دەنێت.

پەیامەکانی نوور دەستکاریی بینین و ڕوانین دەکەن، مەودای بەرەو فراوانی دەبەن، ڕۆشنایین بۆ دەرچوون لە سنوورەکانی دنیای بەرهەست و ناسووت، لەپێناو خوڵقاندنی دنیایەکی تازەدا.

**زیندوێتی:**

وجود لە فەرهەنگی ئەدەبیدا، زیندووە و دەنگی هەیە، یان دەبێ بە دەنگ بهێنرێ. شاعیر و ڕۆشنبیر خەزعەل ماجیدی پێی وایە شاعیر دەبێ ڕۆڵی «ئیسرافیل، فریشتەی زیندووکردنەوە ببینێ.»٢١

دەریا لە شیعردا ئەوە نییە کە لە زانستدا هەیە، لە ئەدەبدا شەپۆل و قووڵاییەکانی، مەخلوقاتی هەناوی، حەکایەتیان هەیە، بە تایبەت لە بەرهەمی سۆفییانەدا، ئاسمان و مانگ و ئەستێرە و باڵندەش، بە هەمان شێوە... مەولانای ڕۆمی یەکێکە لەوانەی کە توانیویەتی بەشێکی گەورە لە حەکایەتەکانی دەریا بگێڕێتەوە.٢٢

(کەسایەتی)یەک لە مێژوودا شتێکە، لە شیعر یان لە ڕۆمانیشدا شتێکی دی، شیعر دیوە گەورەکە دەردەخات، ئاخر بە گوتەی فرۆید: «مرۆڤ وەک چیایەکی سەهۆڵینە، ئەوەی کە بەرچاوە، لوتکەکەیەتی، ئەوی دیکەی دەنێو قووڵاییدایە.» پێغەمبەر (د.خ) لە دەقە شیعرییەکاندا (بۆ نموونە، بەحری نووری مەحوی) هەمان کەسایەتیی نێو سیرەتنامە و مێژوو نییە، لێرە خودی ئەو دەبینرێ و پێوەندیی عیشقی و ڕۆحیی لەگەڵ دەبەسترێ.

لای نوورسییش، (بوون) لەوپەڕی زیندوێتیدایە، ڕۆحی هەیە، پێویستە مرۆڤ دەنگ و ڕەنگی ئاوێتەی ڕۆحی بکات.

نوورسی، زۆر جار گەشتیاری پەیامەکانی دەبات بۆ نێو دنیا گەورەکەی مەخلوقە بچووکەکان، یان بۆ لای مانگ و ئەستێرە بڵندی دەکاتەوە. یان چاوی لە نێو بزاوتی زیندوێتیی زەمیندا نوقم دەکات:

تبسم الازهار من زينة الازهار
تسجع الاطيار من نسمة الاسحار
تهرج الامطار على خدود الازهار.٢٣

بەزیندووزانینی بوون دیدێکی عیرفانییانەی شاعیرانەیە و لای شاعیرانی دیکەش ئامادەیی هەیە،

بۆ نموونە (سوهرابی سپهەری) لە شاعیرانی هاوچەرخدا کە لەم ڕووەوە کاریگەریی مەولانای بەسەرەوەیە. لای شاعیرێکی وەک شێرکۆ بێکەس بە جۆرێکی دی زیندوێتیی سروشت بەرجەستە دەبێ.
یەکێک لە سەرچاوە گەورەکانی دەرخستنی زیندوێتیی وجود قورئانە کە دەیەوێ مرۆڤ لەوە بەئاگا بێت و لەگەڵیدا هاودەنگی ستایش بێ، چونکە ڕێگەیەکی ڕۆشنی پاکڕاگرتن و گەورەکردنی ڕۆحیەتی.٢٤

**ڕۆحانییەت:**
ئەوەی پێشتر لەبارەی تایبەتمەندیی جیهانی شیعر و ئەدەبەوە گوترا، بە تایبەت (زیندوێتیی وجود)، پێوەندییشی بە ڕۆحانییەت و جیهانی ڕۆحەوە هەیە. شیعر، بە تایبەت شیعری دنیای عیشق و عیرفان، زمانی ڕۆح و بەرهەمی ئەزموونی ڕۆحییە، شیعر هەم هاواری ڕۆح و هەم هانا و پەنایەتی.٢٥
پەیامەکانی نوور، بە تایبەت مەسنەوی، بەرهەمی ئەزموونێکی گەورەی ڕۆحین، ڕۆشنایی دڵێکی بێدارن، لە ڕۆحانییەتی قورئان و پێوەندیی ڕۆحی بە سروشتەوە سەرچاوەیان گرتووە، خوێندنەوەشیان زیندوێتی بە ڕۆح دەبەخشێ.

**ئایا نوورسی شاعیر بووە؟**
لەگەڵ ئەو هەموو شیعرییەت و تایبەتمەندییە ئەدەبییەی کە لە زمانی پەیامەکانیدا هەیە، ناکرێ بڵێین نوورسی شاعیر بووە و وەک ئەوان نووسیویەتی، خۆیشی گوتوویەتی «لە بەهرەی شیعری بێبەشم.» بەڵام ئەمە هەر وەک ئاماژەیە بەوەی کە شاعیر نەبووە، ئاماژەشە بەوەی کە (بەهرەی شیعری)ی لا گرنگ بووە و چەند جارێکیش باسی کردووە.
بەشێکی بەرچاویش لە بەرهەمەکانی وەک شیعر و دەقێکی ئەدەبی داڕێژراون، هەروەهاش نەخشاندوونی، بۆ نموونە: (وتەکان/ حەقدەیەم/ سکالا بەڵایە/ خۆی دەڵێ ئەم برگانە لە شیعر دەچن)، یان (لالانەوەی هو الباقی) کە دیسان ئاماژە بەوە دەکات لەبەر نەبوونی بەهرەی شیعری بۆی تەواو نەکراوە.
لە (بەرهەمی سەرنجدانێک)دا، (کە لەسەر لوتکەی چیایەک نوقمی جوانیی دیمەنی دارستانێک بووە و لەرینەوەی درەختەکانی بە کۆرێکی زیکر چواندووە...) دەڵێ: «یەکسەر لەو دیمەنەوە، ئەم برگە کوردییەی شێخ ئەحمەدی جزیری مەلای جزیری)م هاتەوە یاد:
هەرکەس بە تماشاگەهی حوسنا تە ژ هەر جا
تەشبیهی نیگاران ب جەمالا تە دنازن

«جا بۆ دەربڕینی واتاکانی ئەو ئامۆژگاری و پەندانەی کە لەو دیمەنەوە هەستم پێ کرد، (دڵ)م بەم شێوەیەی خوارەوە دایە پرمەی گریان: موناجات......»
وەک دەزانین، پەیامەکانی نوور بە تورکی نووسراون، بەڵام (مەسنەویی نووری) بە عەرەبی بۆی نووسراوە، لە کاتێکدا لەبەر ئەو هۆگرییە ڕۆحییەی کە بە (مەولانا و مەسنەوی)یەکەیەوە هەیبووە، دەبوو بە فارسی بینووسیایە.
هەر لە مەسنەویدا دەقیشی تێدایە کە بە فارسی بۆی هاتووە، بەو زمانەش نووسیویەتی، یان وشەی کوردی و تورکییشی تێکەڵ کراوە. بۆ نموونە: بەرهەمی سەرنجدانێک/ لالانەوە.٢٦
من وا دەزانم لەو چەند نووسینەدا نەیویستووە (مانا لە زمان) جودا بکاتەوە، یان لەوانەیە ڕەچاوی ئەوەی کردبێ کە وشەی کام زمانیان کەرەستەی جوانتری دەربڕینی ئەو پەیامە یان ئەو ڕستەیەی پێیە... ئەمەش شتێکی دی لە شیعرییەتی نووسینەکانی دەردەخات.
نوورسی زۆر باش دەرکی بەوە کردووە کە گونجاوترین زمان بۆ قسەکردن لەسەر ئیمان و مەعنەوییەت و ڕۆحانییەت، زمانی شیعر و ئەدەبە، چونکە ئەو زمانە دەرکەوتەیەکی ڕۆح و مەعنەوییەتە،

سەعیدی نوورسی

زمانی قورئانیش دەرخەری ئەم ڕاستییەیە.

**دوو سەرچاوە گەورەکەی ئەدیببوونی نوورسی:**

یەکەم/ قورئانی پیرۆز:

دەتوانم بڵێم مامەڵەی نوورسی لەگەڵ قورئاندا، مامەڵەی عاریف و شاعیری گەورە (ئیقباڵی لاهوری)یشی تێپەڕاندووە «کە ئەو هەمیشە وەها چووەتە خزمەتی قورئان، وەک بڵێی بۆ خۆی دابەزیبێ.»

نوورسی ڕۆحی ئاوێتەی ڕۆحی قورئان کردووە و نوقمی ئەو دەریایە بووە، بۆیە توانیویەتی پەیامەکانی بەو زیندوێتییە لە نوور بنەخشێنێ، خۆیشی بە جەختەوە چەند جارێک باسی ئەمەی کردووە.

ئاخر قورئانی پیرۆز، ئەگەر دیوێکی (زمان و شەریعەت) بێ، ئەوا دیوێکیشی (ڕۆحانییەتە)، ڕۆحانییەتیش خوڵقێنەری مانای بەرز و زمان و جوانکاریی هونەرییە.٢٧

نوورسی، بەرانبەر بە قورئان، بە تایبەت زمانەکەی، سەرسامییەکی عاریفانە و شاعیرانەی بۆ دروست بووە. (پەیامی موعجیزاتی قورئانی) بەشێکە لە بەرهەمی ئەو سەرسامییە، بێگومان ئەمەش بووە بە ڕێنیشاندەری بۆ ئاوێتەکردنی مەبەستی بەرز بە زمانی شیعر و ئەدەب و ڕەوانبێژی.٢٨

لە قۆناغی دووەم و کۆتایی ژیانیدا خۆی بۆ خوێندنەوە و ڕاڤەی (سێ کتێبی گەورە) کە ڕاڤەکاری یەکدیشن، یەکلایی کردووەتەوە: «کتێبی نووسراوی ئاسمان، قورئان، کتێبی بینراوی گەردوون، کتێبی نبووئەت.» کۆشاوە ئایەتەکانی گەردوون لە قورئاندا، ئایەتەکانی قورئانیش لە گەردوون و لە نبووئەت و ئاسمانی ئەخلاقی پێغەمبەردا (د.خ) بە درەوشاوەیی ببینێ.٢٩

یەکێک لە جۆرەکانی خوێندنەوەی دەق، لەپێناو بەرهەمهێنانی دەقێکی نوێدایە. نوورسییش (بوون)ی بە دەقێک زانیوە کە هەر وشەیەکی کتێبێکە و لەژێر هەر پیتێکیدا قەسیدەیەکی بەرز نووسراوە: حتی کان الشجرة المزهرة....قصیدة منظومة محررة/مەسنەوی نوری»...

خوێندنەوەشی بۆ ئەو کتێبە و بۆ دەقی قورئان دەقی دیکەی لێ بەرهەم هاتووە، بە تایبەت لە (مەسنەویی نووری)دا.

بەدەقزانینی بوون شاعیران و ئەدیبانی دیکەش قسەیان لەبارەوە کردووە.

نوورسی نەک هەر ئەدیبانە نووری قورئانی نووسیوەتەوە، بەڵکو هەوڵیشی داوە لە تیشکی ئایەتەکانی، نەخشەی قوتابخانەیەکی ئەدەبی بکێشرێ.٣٠

دووەم/ نوورسی و تەسەوف و عیرفان:

(نوورسی)مان بە (زانایەکی عاریف) ناو برد، بۆیە پێویستە قسە لەبارەی (عاریفبوون)یشیەوە بکەین، چونکە باشتر ڕۆحە شاعیرانەکەی و ئەدیبوونی دەردەکەوێ، چونکە ڕێگەی ئەدەب و عیرفان ڕێگەیە بەرەو کەشف و خوڵقاندنەوە، چونکە شیعریش وەک تەسەوف زێتر لەگەڵ نادیاردا مامەڵە دەکات.

با سەرەتا ئەوە بڵێین؛ کە نوورسی خۆی بە ڕاشکاوی گوتوویەتی: «من شێخی تەریقەت نیم، بەڵکو زانایەکی ئایینییم.»٣١

بەڵام:

لە سەرەتای خوێندنیدا، تەریقەتی نەقشبەندی کە لە کوردستاندا زۆر بڵاو بووە، نەخشی گەورەی هەبووە لە دروستکردنیدا، زۆریش بە مەولانا خالیدی ڕێبەری تەریقەتەکە سەرسام بووە.٣٢

هەروەها (ئیمامی ڕەببانی، شێخی گەیلانی، ڕۆمی، ئیقباڵی لاهوری)ی بە شێخ و مامۆستای خۆی زانیوە، سوودی لە (غەزالی، ئیبن عەتاوڵڵای سکەندەریی) وەرگرتووە، بەڵام خۆی بە موریدی تەریقەت و مەسلەکی کەسیان نەزانیوە، چونکە ئەمیش (گەیلانی و ڕەببانی)یەکی سەردەمی خۆی بووە، هەر ئەوە بووە کە تەریقەتی سۆفیگەریی بەو فۆرمەی جاران بە گونجاو نەزانیوە (ئەمە قسەی دیکەشی دەوێ) باوەڕیشی وەها بووە «ئەگەر ئەوانیش لە ڕۆژگاری ئەمدا بژیانایە، هەر وەک ئەمیان دەکرد.»٣٣

نوورسی، تەسەوفی بۆ ژیانی ئایینداریی گشتی، تەنانەت بۆ پاراستنی قەوارەی سیاسیی موسوڵمانانیش بە سەرمایەیەکی گەورە زانیوە، بۆ خۆیشی لە تەزکیەی ڕۆحی و کەشف و شهودی مانا ئیمانی و قورئانییەکان پشتی پێ بەستووە،

ڕەمز و زمان و زاراوەکانی تەوزیف کردووە. نوورسی کە ڕەخنەی چەند لایەنێکی تەسەوفیشی کردووە، شتێکی کەمی ڕەت کردووەتەوە.٣٤ ڕەتکردنەوەکەشی بە زمانی ڕەخنەی لۆژیکی و بە ویژدانێکی بێدار و هاوسەنگییەوە بووە، ئەو عاریف و سۆفییانەی لای هێندێ زانا و فەقیهی دی تەکفیر کراون، لای ئەم بە گەورە ناو براون (بۆ نموونە: ئیبن عەرەبی)، بەڵام ڕەخنەی بابەتییانەشی لە تیۆرەکەی (وحدة الوجود) گرتووە. (ڕەخنەکردنی تەسەوف، یان نەبوون بە شێخی تەریقەت)، مانای عاریفنەبوونی ناگەیەنن.

ڕاستە نوورسی باوەڕی وەها بووە کە لە ڕۆژگاری ئەودا: «ئیمان لە ڕێگەی حەقایقی قورئان و نبووئەتەوە باشتر دەپارێزرێ، نەک تەریقەت و ویلایەت.» بەڵام خۆیشی زێتر لە ڕێگەی (کەشف و شهود)وە بە حەقیقەتە قورئانی و ئیمانییەکان گەیشتووە، نەک نەقڵکاری و عەقڵکاریی ڕووت. گوتمان «مەسنەویی نووری، جۆرە تەفسیرێکی شهودی یان ڕۆحیی ئایەتەکانی قورئانە.» (ئیمان)ەکەشی، بە هەمان شێوە، ئەزموونی و شهودی، واتە عاریفانە بووە.

ئەوەی لەم ڕووەوە لە ژیانی نوورسیدا هەیە، لای بەشێکی زۆر لە ڕاڤەکارانی قورئان و زانایانی شەریعەت، هەستی پێ ناکرێ.

بەڵێ نوورسی زانایەکی گەورە بووە، (زانست و فیکر و جۆرێک لە فەلسەفەکاری و کەلام)یشی بەرهەم هێناوە.٣٥ بەڵام عاریفانە، ئەوانەی ئاوێتەی تەزکیە و عیرفان و بێدارکردنەوەی ڕۆحی کردووە. زۆر جار لە ئەدەبیاتی دینیدا (عیلم و عیرفان) وەک دوانەیەک بەسەر زماندا دێن، کەچی کەم جار ڕێک دەکەوێت (عیلم) عیرفانیش بێ، بەڵام عیلمی نوورسی عیرفانیش بووە.

بە بۆچوونی عەللامەی شەهید (ناسری سوبحانی)، «لە ڕوانگەی قورئانەوە، (عالیم) دەبێ (عاریف و ئەهلی دڵ و ناخیش بێ، (نەک هەر ئەوەی لە زانستدا شارەزا بێ)، چونکە عیلمی قورئانی، ناسین و شهود و ڕۆحییشە، مەبەستیشی لە (عیلم و عالیم) عیرفان و عاریفیشە.

خۆ ئەگەر وەزیفەی (چاو، گوێ، دڵ) بەو وەزیفەیە بزانین کە قورئان دیاریی کردووە، نەک تەنها (بینین و بیستن و وەزیفە ئەندامییەکە)، ئەوا بۆچوونەکەی (سوبحانی)مان لا دروستتر دەبێ.٣٦

نوورسیش بەپێی ئەم بۆچوونە قووڵە و بەو پێیەی کە خاوەنی (بەسیرەت و دڵێکی داگیرساو بووە بە نووری زمانی وەحی)، عاریف بووە.

شێوازی نووسین و گەیاندنی پەیامەکانیشی ئەو تایبەتمەندییەی پێوە دیارە، بەردەوام دڵ و ڕۆحی بەرانبەری دواندووە، نەک بە تەنها عەقڵی.

هەروەها نوورسی خاوەنی ئەخلاقێکی عاریفانەش بووە، ئەمەش تەنها بە زانایی (بە مانا باوەکەی) دروست نابێ، چونکە دەکرێ کەسێک مامەڵە ئەخلاقییەکەی لە ئاست زانایەتییەکەیدا نەبێ «قورئان ئاماژەی بەم جۆرە لە زانایەتییش کردووە.»٣٧

لە پێشەوەش باسمان لەوە کرد؛ کە چۆن لە قۆناغی دوایی تەمەنیدا، نوقمی خەڵوەت و ڕامان و موجاهەدەی ڕۆحی بووە.

هەموو ئەمانەش نیشانەی درەوشاوەی عاریفبوونی نوورسین.

جا نوورسی کە عاریف بووبێ، دەبێ خاوەنی ڕۆحێکی شاعیرانە و زمانێکی ئەدەبییش بێ، چونکە وا دەزانین جەوهەری ئەزموونی عیرفانی و عاشقانە زێتر لە شیعردا بەرجەستە دەبێ، لەبەر ئەوەی شیعر نزیکترین زمانە لە دنیای ڕۆح و عیشقەوە، ئەوەی لەو بارەوە بە شیعر دەگوترێ، بە هیچ جۆرە نووسینێکی دی ناگوترێ.

مەولانا خالید، کۆمەڵێک نووسین و نامەی هەبووە، بەڵام (ڕۆحەکەی) لە شیعرەکانیدایە.

مەولەویی تاوەگۆزی زانایەکی گەورەش بووە، بەڵام عیشقەکەی لە دیوانەکەیدایە، تەنانەت بەرهەمە زانستییەکانیشی کە بە هۆنراو (نظم) نووسیونی،



سەعیدی نوورسی

تەرایی عیشق و عیرفانیان پێوە دیارە، لە کاتێکدا بۆ وشکەبابەتی وەها ئەمە کارێکی ئاسان نییە، بەڵام دیارە (عالیم)بوونی ئەمیش مانای (عاریف) بوونیشی بووە.
مەولانای ڕۆمی، ڕەنگی سووتانی، لە (مەسنەویی مەعنەوی) و زێتریش لە (دیوانی شەمس)دایە.
شتێکی دی کە زێتر عاریفبوونی نوورسی دەردەخات، نزیکبوونی بووە لە ڕۆحی (مەولانای ڕۆمی و ئیقباڵی لاهوری)یەوە.
نزیکبوونی لە ڕۆمییەوە بە ئاستێک بووە، (مەسنەویی نووری)ی بە (مەسنەوی)یەکەی ئەو زانیوە بۆ سەردەمی خۆی، بە کاریگەریی ئەویش نووسیویەتی و ئەو ناوەشی لێ ناوە، لە بەشێک لە پەیامەکانیشیدا داستان و ڕەمز و بەیتەشیعری لێ خواستووە، سەرچاوەی هەردووکیشیان قورئان بووە و خۆیان بە خزمەتکاری قورئان ناو بردووە.٣٨
لە زۆر ڕوویشەوە، لە (ئیقباڵی لاهوری)یەوە نزیک بووە: «شۆڕشگێڕی، قورئان سەنتەری، نوێکردنەوەی ئایینداری، ڕەخنەکردنی ڕۆژئاوا لە ڕووی زاڵبوونی دیوی مادیی شارستانییەتەکەی بەسەر ڕۆحانییەتدا، ئەخلاقی عاریفانە، پەرۆشی بۆ نەتەوەی خۆی و جیهانی ئیسلامەتی، عیشق بۆ پێغەمبەر، شارەزایی قووڵ لە زانستی کۆن و زانست و فەلسەفەی نوێدا، خودناسی، شەیدایی بۆ سروشت، سەرسامیی هەردووکیان بە مەولانای ڕۆمی.»٣٩

**پەیامەکانی نوور بە کوردی:**
وا دەزانم وەرگێڕی پەیامەکان (لە عەرەبییەوە بۆ کوردی)، لەبەر ئەوەی عاشقانە پەرۆشی کارەکەی بووە، نەک هەر کات و توانست، بەشێکی زۆر لە تەمەنی خۆیی وەقفی پەیامەکان کردووە و بە ڕۆح لەگەڵیاندا ژیاوە، توانیویەتی بۆن و بەرامە و چێژی جوانکارییە ئەدەبییەکە بگەیەنێ، لە کاتێکدا ئەمە کارێکی ئاسان نییە، بە تایبەت ئەگەر وەرگێڕان لە زمانی دووەمەوە بوو، چونکە هەموو دەقێک بە تایبەتمەندیی زمانەکەی خۆیەوە نووسراوە.
هەروەها، بەرزیی ئاستی شارەزایی مامۆستا لە زمانی عەرەبی و (کوردی)زانییەکەی هۆکارێکی دیکەی سەرکەوتنیەتی لە کارەکەیدا. (لە کاتێکدا کە هێندێک لە نووسەر و ڕۆشنبیرانی ئایینیمان بە داخەوە وەک پێویست شارەزای زمانەکەیان نین و جێگەی بایەخپێدانیان نییە، ئەو زمانەی کە بە بابەتی ئایینی پڕاوە و ڕەنگی بۆ ڕێژراوە.)
مامۆستا فارووق بەم کارەی ئەوەی دەرخستووەتەوە کە زمانەکەمان لە کایەی ئایینییشدا خاوەنی کەرەستە و گەنجینەیەکی گەورەیە. خوێنەر بە هێندێک چەمک و وشەی وەهای زمانەکەی ئاشنا دەکات کە پێشتر ئەو ئاشنایەتییەی نەبووە.
بەش بە حاڵی خۆم، لە خوێندنەوەی (کوردی)ی پەیامەکاندا، جەزبی مانا و گرشەی جوانکارییەکان بووم و هەستم بە نزیکبوونەوە لە ڕۆحی (نوورسی) کردووە.

**تێبینی:**
ئەوەی لە بارەی شیعرییەت و وەزیفە و ڕەگەزەکانی شیعر و ئەدەبەوە گوتوومانە، بێجگە لەو سەرچاوانەی ئاماژەمان پێ کردوون، لە لای زۆری دیکەش لە شاعیران و ڕەخنەگرانی ئەدەب هەمان ئەو بۆچوونانە هەن. بۆ نموونە بڕوانە ئەم دوو سەرچاوە بە کوردی کراوەش:

شیعر چییە؟ لۆرانس پیرین. و. ئەبوبەکر خۆشناو، ٢٠٠٨.
دەربارەی شیعر و شاعیری، حەمەکەریف عارف، ٢٠٠٧.

**پەراوێزەکان:**

١- ندوة سعید النورسی ادیبا، بکلیة الاداب و العلوم الانسانیة، الدار البیضاء، المغرب، ٢٠٠٣... یەکێکە لە نموونەی ئەو کارانە و باسەکانی لە کتێبێکدا بە ناونیشانی (النورسی ادیبا) لە ٢٠٠٤دا چاپ کراوە.
٢- شعریة الحکي في رسائل النور، ص، ١٢٣، لە پەراوێزی (١).
٣- النورسي و الادب الایماني، ص، ٨٩، لە پ (١).
٤- کلیات رسائل النور، المثنوي العربي النوري، بدیع الزمان سعید النورسي، ط١، ٢٠٠٩، مصر، تحقیق احسان قاسم الصالحي، المدخل الاستاذ ادیب ابراهیم الدباغ، ص، ٤٤ هەروەها: شعریة النص فی المثنوي العربی النوري، ا.د. حسن الامراني، النورسي ادیب الانسانیة، ص، ٤٣.
٥- پ ١، ل٧٣.
٦- پ ٤، ص، ١٢٨، هەروەها: ا.د. حسن الامراني، النورسي ادیب الانسانیة، ط٢، ٢٠٠٦، ص ٧٤.
٧- سەرجەمی پەیامەکانی نوور، ١، وتەکان، ل ٣١٥، فارووق ڕەسووڵ یەحیا کردوویە بە کوردی، ٢٠٠٤.
٨- پ (١)، ل٧٥.
٩- پ (٧)، مەکتووبی ٦، ل ٣٧ هەروەها: د. ابراهیم ابو ربیع، الاسلام علی مفترق الطرق، رحلة فی حیاة و فکر النورسي، ط١، ٢٠٠٥، ص، ٩٨.
١٠- المثنوي النوري، ص ٤٥٩ هەروەها: پ ٧، وتەکان، ل ٣٠٧ قەسیدەکە بە ناوی (هو الباقي)یەوە...
١١- پ ٧، وتەکان، ل ٣١٥.
١٢- د. الفت کمال الروبي، نظریة الشعر عند فلاسفة المسلمین، مهمة الشعر، اللذة، ص، ١٢٥، پاشان بڕوانە: پ ١ (الجمالیة و الجمال عند النورسي، د. محمد خروبات، ص٤٥، هەروەها: ص، ١٢٤.
١٣- ا.د. الامراني، ص، ٧٦. هەروەها: پ ١، رموز صوفیة و شعریة عند بدیع الزمان، البلبل والورد، ا.د. جورج الغریغوری، رومانیا.
١٤- پ ١٢، ص٣٠-٦٣.
١٥- پ ١٣، ص ٦٤، هەروەها: المثنوي النوري، ص ١٢٧.
١٦- سەرجەمی پەیامەکانی نوور، ٢، مەکتووبات، و: فارووق ڕەسووڵ یەحیا، چ٢، ٢٠٠٧، ل ٦٢٢، هەروەها، پ ١، ص ١٢٧.
١٧- د. احمد محمد سالم، تجدید علم الکلام، قراءة فی فکر سعید النورسي، سوزلر للنشر، ط١، ٢٠١٠، ص٢٠١.
١٨- ا.د. الامراني، ص١١٢.
١٩- خزعل الماجدی، العقل الشعري ط١، ٢٠١١. هەروەها: ادونیس، زمن الشعر، ط٧، ٢٠١٢، المقدمة.
٢٠- ا.د. الامراني، ص ٦٠، هەروەها: المثنوي النوري.
٢١- پ ١٩.
٢٢- بڕوانە: د. عەبدولکەریم سروش، قوماری عاشقانە، و: هێرش کەریم، چ٢، ٢٠١٥، ل ٣١٨.
٢٣- بۆ نموونە: بڕوانە: پ ٧، پەیامی وتەکان، ل ٣١٤، هەروەها، پ ١، ص ٧٧.
٢٤- بڕوانە: نەبەز هەورامی، بزوتن لە خولگەکانی عیشقدا، ٢٠١٣.
٢٥- پ ١٩، الماجدی.
٢٦- بڕوانە: وتەکان، ل ٢٩٢، ل ٣٠٤، ل ٣٠٧، ل ٣١٠.
٢٧- نەبەز هەورامی، ڕۆحانییەتی قورئان، گۆڤاری ئاییندەسازی، ژ ٤٠، ٢٠١٦.
٢٨- د. الامراني، ص١٠٧. و پ١، ١٢٣.
ئەدیبان و شاعیران و ڕەخنەگران لە کۆن و نوێدا بە قووڵی بەر کاریگەریی زمانی قورئان کەوتوون و کردوویانە بە بابەتی لێکۆڵینەوە. بڕوانە: ئەدۆنیس، شیعرییەتی عەرەبی، و: عەبدولموتەڵیب عەبدوڵڵا، ٢٠١٢، ادونیس، النص القراني و افاق الکتابة، ط ١، ١٩٩٣.
٢٩- وتەکان، نۆزدەیەم، ل ٣٢٣، لە سێزدە (بریسکەی

مەسنەوی)یشدا باسی کتێبی گەردوون کراوە...
هەروەها: د. احمد محمد سالم، تجدید علم الکلام.
هەروەها: پ ١.
٣٠- د. الامراني ص ١٤٠، (الادب القراني)، هەروەها: الاسلام على مفترق الطرق، بلال قوشبينار، ص ١٨٣ هەروەها: المثنوي النوري، المدخل.
پێش نوورسی، کەسانی دیکەش قورئانیان بە سەرچاوەیەکی گەورەی ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبیی زانیوە، وەک (عەبدولقاهری جورجانی و ئیبن ئەسیر)ی مێژوونووس و کەسانی دی، بڕوانە: ئەدۆنیس، شیعرییەتی عەرەبی، و: عەبدولموتەڵیب عەبدوڵڵا، ٢٠١٢.
٣١- مەکتووبات، ل ١٠٥، هەروەها: پ ١، ص ١٤٣، هل كان بديع الزمان النورسي صوفيا، د. سعيد الغزاوي.
٣٢- د. ابراهيم ابو ربيع، پ٣٣، ص٩٣.
٣٣- بۆ پوختەی هەڵوێستی بڕوانە: مەکتووبات، کوردی، بەشی نۆیەم، ل ٧٥١، د. احمد محمد سالم، تجديد علم الكلام، ص ١٦٤. هەروەها: پ ١، البعد الصوفي عند بديع الزمان، من خلال كتاب اللمعات، د. عبدالفتاح المهدي، المغرب، ل ٩٥.
٣٤- د. ابراهيم ابو ربيع، ترجمة: محمد فاضل، الاسلام على مفترق الطرق، رحلة في حياة و فكر بديع الزمان، ط ١، ٢٠٠٥، پ ١، ص ٧٩، ١٤٣. بڕوانە: مەکتووبات، کوردی، ل ٦٣٧، وەڵامی پرسیاری نهێنیی کاریگەریی پەیامەکان، هەروەها د. محمد احمد سالم، تجديد علم الكامل ٢٠٣.
بە زمانی کوردییش، مامۆستا (تەحسین حەمەغەریب) قسەی لەبارەی عاریفبوونی نوورسییەوە کردووە، بڕوانە: (دوایینەکان، بەشی یەکەم، نوورسی دوایین ئەزموونی عیرفانیی لە شارستانییەتی ئیسلامیدا) کتێبی هەژان، ١، ٢٠٠٧.
٣٥- بڕوانە: ناسری سوبحانی، ناوە جوانترینەکانی خودا، ئا. د. جەهانگیر وەلەدبیگی، و: لە فارسییەوە، جووتیار قارەمان، ٢٠١٦. هەروەها: سوبحانی، ئەحکام و حیکمەتەکانی ڕۆژوو، سەرچاوە سەرەکییەکانی دەستخستنی (عیلم) ل ١١، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای بەرهەم، ٢٠١٦.
٣٦- الاعراف، ١٧٥-١٧٦.
٣٧- ا.د. الامراني، ١٣٦، الرمز الصوفي بين الرومي و النورسي.
٣٨- سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢١.

**سەرچاوەکان:**


١- النورسي اديبا، باقلام نخبة من المعنيين بشؤون الفكر و الادب، ندوة سعيد النورسي اديبا، بكلية الاداب و العلوم الانسانية، الدار البيضاء، المغرب، ٢٠٠٤.
٢- ا.د. حسن الامراني، النورسي اديب الانسانية، ط٢، ٢٠٠٦.
٣- كليات رسائل النور، المثنوي العربي النوري، بديع الزمان سعيد النورسي، ط١، ٢٠٠٩، مصر، تحقيق احسان قاسم الصالحي.
٤- د. ابراهيم ابو ربيع، الاسلام على مفترق الطرق، رحلة في حياة و فكر النورسي، ط١، ٢٠٠٥، سوزلر للنشر.
٥- د. احمد محمد سالم، تجديد علم الكلام، قراءة في فكر سعيد النورسي، سوزلر للنشر، ط١، ٢٠١٠.
٦- خزعل الماجدي، العقل الشعري، ط١، ٢٠١١.
٧- د. الفت كمال الروبي، نظرية الشعر عند فلاسفة الممسلمين، ت. رمسيس يونان، ٢٠٠٧.
٨- سەرجەمی پەیامەکانی نوور، ١، وتەکان، فارووق ڕەسووڵ یەحیا، کردوویە بە کوردی، ٢٠٠٤.
٩- سەرجەمی پەیامەکانی نوور، ٢، مەکتووبات، و. فارووق ڕەسووڵ یەحیا، چ، ٢، ٢٠٠٧.

# ئەستێرەیەک لە باکووری کوردستان هەڵهات و لە باشوور پرشنگی دایەوە

**فەرمان عوسمان**
م.ی. زانکۆی چەرموو
farman.osman.bbf@gmail.com

زانای ناوداری کورد مامۆستا «بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی» هەر لە منداڵییەوە وەکو ئەستێرەیەک تیشکی خۆری زیرەکیی هەڵهاتووە و لە تاریکاییەکانی ئەو کاتەوە تا ئێستا پرشنگی داوەتەوە و تەواوی هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی و گوندنشینانی دەوروبەری شایەتیی ئەم لێهاتووییەی بۆ دەدەن. هەر بە هۆی ئەم زیرەکییەی بووە کە توانیی سەرجەم پلەکانی خوێندنی ئەو کاتە بە ماوەیەکی زۆر کەم و بە خێرایی ببڕێت، تەنانەت نیوەی فەرهەنگی «قاموسولموحیت» و هەندێک لە مەتنی کتێبەکان لەبەر بکات و لە سەرەتای تەمەنی چواردە ساڵیدا بڕوانامەی زانایی وەربگرێت! بەمەش ناوبانگی بە (مەلا سەعیدی مەشهوور) بڵاو دەبێتەوە.
تەمەنێکی وەها کەم و شارەزایی زانستیی لەم شێوەیە بە دیاردەیەکی مێژوویی دەگمەن دادەنرێت.
ئەم زانا گەنجە هەر زوو دەستی کردووە بە وتنەوەی وانەکانی و لە شاری (وان) قوتابخانەی تایبەت بە

خۆیی هەبووە.

یەکێک لە دیاردە جیاوازەکانی قوتابخانەکەی ئەوە بوو کە لە پاڵ زانستە شەرعییەکاندا وانەی زانستە سروشتییەکانیش دەخوێنران و گرنگییان پێ دەدرا. ئەم شێوازە جیاوازەی پرۆسەی خوێندن ناوازەیی ئەوی زیاتر بۆ دەوروبەر سەلماند و بەو هۆیەوە بازی بەسەر ئەو نەریتە پێشووەی خوێندنی حوجرەکاندا دا و ئەمەشی لە مێژوودا بۆ نووسرا. بەدیعوززەمان تەنها بەمەوە نەوەستا، بەڵکو پێش یەکەم جەنگی جیهانی هەوڵ و تەقەلای دا زانکۆیەک لە کوردستاندا بکرێتەوە کە هەموو زانستە جۆراوجۆرەکانی تێدا بخوێنرێت. ڕەنگە یەکەم کەس بووبێت ئەم جۆرە داواکارییە ناوازەیەی پێشکەش بە دەوڵەت کردبێت و تا ئەو پلەیەش لە خەمی بڵاوبوونەوەی زانست لە ناو نەتەوەکەیدا بووبێت.

جددیبوون لەگەڵ بونیادی ئەم زانایەدا هەڵشێلرابوو، چونکە لە گەرمەی یەکەم جەنگی جیهانی و لەژێر ناڵەی تۆپ و لە سەنگەرەکاندا نەیدەهێشت کاتی بە زایە بچێت، بەڵکو هەر دەرفەتێکی بۆ بڕەخسایە، خەریکی نووسین دەبوو، چونکە لە دەرفەتەکاندا دەستی دایە دانانی کتێبێک بە ناوی (ئاماژەکانی ئیعجاز). ئەم کتێبە یەکێکە لە بەنرخترین کتێبە ناوازەکان و تەفسیری چەند ئایەتێکە لە ڕووی دەربڕین و ئیعجازی ڕەوانبێژیی قورئانەوە، ئێستا بە چەند زمانێک تەرجەمە کراوە و بە کوردییش لە بەردەستدایە.

لە دوای جەنگی جیهانی و ئارامبوونەوەی وڵات و ئەو ئاڵوگۆڕانەی ڕوویان دا، مامۆستا بەدیعوززەمان بڕیارێکی گرنگی سەبارەت بە ژیانی خۆی دا، کە بریتی بوو لە پشتهەڵکردن و دوورکەوتنەوەی تەواوەتی لە گۆڕەپانی سیاسی.

تەنانەت ماوەیەکیش بە تەنیایی و گۆشەگیری دەژیا، ئیتر لێرەوە قۆناغی دووەمی ژیانی دەستی پێ کرد کە ناوی نابوو (سەعیدی نوێ) و قۆناغی تەمەنی ڕابوردووشی بە (سەعیدی کۆن) ناو دەبرد.

پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگیرێت کە سەعیدی کۆن لە تەمەنی چواردە ساڵییەوە تا سەروو چلوپێنج ساڵی زانایەکی دامەزراو بووە و ئاسۆی زانست و بیری ڕۆشنبیریی تا دەهات فراوانتر دەبوو، تێگەیشتنیشی بۆ بابەتەکان باشتر دەپێکا. ئەم پێشەنگە ئاستبەرزە لەم قۆناغە نوێیەی دوای چلوپێنج ساڵیدا ئاڕاستەی خۆیی گۆڕی بۆ بوارێک کە بە لایەوە شایانتر بوو ژیانی خۆیی بۆ بەخت بکات.

سەعیدی نوێ، لە دوای ئەو تەمەنەوە، کاتەکانی ژیانی تایبەت کرد بۆ دانانی چەند کتێبێک کە هەموویان لەژێر ناوی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)دان. زۆربەی ئەم کتێبانەشی لە ناو بەندیخانەکان و لەژێر چاودێریی توندی دەسەڵاتی ئەو ڕۆژگارەدا نووسیون. سەرجەمی پەیامەکانی نوور زۆرینەیان بە زمانی تورکی و هەندێکیشی بە عەرەبین و وتاریشی بە زمانی کوردی هەیە کە هیی سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانییە.

لەبەر گرنگی و بەپێزیی ئەم نامیلکە و کتێبانە و لەگەڵ ئەو هەموو چاودێرییە سەختەشدا، بە دەسخەت دەنووسرانەوە و دەستاودەستیان پێ دەکرا و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بە شەقام و کۆڵانەکانی شارەکان و لە ناو گوندە نزیک و دوورەدەستەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و شاخ و دەشتاییەکانی سەرانسەری وڵاتدا بڵاو دەبوونەوە. تەنانەت سنووری وڵاتیان تێپەڕاند و گەیشتنە دەرەوەی تورکیا، وەک میسر و پاکستان و ڤاتیکان و شام و عێراق. شاری کەرکوکیش لە کوردستانی باشوور بەشی خۆی لە مێژووی خزمەتکردن بەم زانا ناودارەی کورد نەخشاند و لە دواساڵەکانی حەفتاکانی سەدەی بیستەمدا لەوێ وەرگێڕانی ئەو بەرهەمانەی «نوورسی» بۆ زمانی عەرەبی لە لایەن مامۆستای بەڕێز ئیحسان قاسم ساڵحی دەستی پێ کرد...

دوابەدوای ئەو، لە شاری سلێمانییش لە سەرەتای هەشتاکاندا مامۆستا فارووق ڕەسوڵ یەحیا دەستی دایە وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بەدیعوززەمان بۆ زمانی کوردی (زاری سۆرانی) و لە ساڵی (١٩٨٤)دا یەکەم کتێبی وەرگێردراوی مامۆستا بەدیعوززەمانی بە زمانی کوردی بە ناوی (پەیامی بیماران) لە چاپ دا. تا ئێستاش مامۆستای ناوبراو لە وەرگێڕانی ئەو بەرهەمانەی بەدیعوززەمان بەردەوامە و گەیشتووەتە دواقۆناغەکان. هەر وەک

بە شێوەی بەرگی گەورە و کتێبی بچووک بڵاویان دەکاتەوە.
لێرەدا دەمانەوێت بە خێرایی ناساندنێکی ئەو بەرهەمانەی نوورسی بۆ خوێنەری بەڕێز بکەین کە تا ئێستا بە زمانی کوردی (زاری سۆرانی) بڵاو کراونەتەوە، بە تایبەت بەرگە گەورەکان کە لەژێر ناوی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور) دان و ژمارەی لاپەڕەکانی هەریەک لەو بەرگانە لە ٧٠٠ لاپەڕە زیاتر یان شتێک کەمترە:
١- بۆ یەکەم جار ساڵی ٢٠٠٤ کتێبی (وتەکان) لە شێوەی بەرگی گەورەدا چاپ کرا. ئەم کتێبە بریتییە لە سیوسێ (وتە). مامۆستا بەدیعوززەمان گەلێک باسی گرنگی ئیمانیی لەم کتێبەدا هێناوە کە پایەکانی ئیمان و باوەڕی تەواو، هۆکار و ئەنجامی پەرستش، ڕوونکردنەوەی جۆرەکانی و ڕاڤەکردنی ئەو وشانە کرۆکی ئەم وتانەن.
کتێبی (وتەکان) وەڵامی گومانەکان سەبارەت بە ڕاستییەکانی ئیمان و بابەتە غەیبییەکان دەداتەوە و بنچینەکانی ئیمان دامەزراوتر دەکەن. بۆ ئەمەش زۆر بەڵگەی زانستی و قەناعەتبەخشی تێدا دەبینرێن. تەنانەت وەڵامدانەوەی هەندێ بۆچوونی فەلسەفە و شیکردنەوەی تێڕوانینی بۆ «بوون» لە بابەتەکانی ئەم کتێبەن. هەر وەک لە لایەکی ترەوە گرنگی بە مەسەلەی پێغەمبەرێتی دەدات و بەڵگەکانی ڕوون دەکاتەوە و زیاتر خوێنەر ئاشنای ئەم لایەنە دەکات.
٢- کتێبی دووەم کە ناوی (مەکتووبات)ە، ئەویش چاپ کراوە و بە هەمان شێوە لە سیوسێ (مەکتووب) پێک هاتووە. مەکتووبەکان کاریان تێڕامانە لە هەندێ ئایەتی قورئانی پیرۆز و شیتەڵکردنی ماناکانیان بە شێوەیەک کە تاسەمەندیی خوێنەر بشکێنن. هەروەها لەم کتێبەدا گرنگیدان بە عیشق و عیرفان و خۆپاڵفتەکردن و ئامادەباشی بۆ خواناسی پشکی گەورەیان پێ دراوە. هەر وەک باسی موعجیزەکانی پێغەمبەر (د.خ) و شرۆڤەکردنی ڕاستیی ئەو هەواڵانەی کە لەمەڕ موعجیزە دەدوێن، جێی دیاریان هەیە و گرنگیی برایەتییش لە نێو موسوڵمانان و پەیوەندیی دۆستایەتییش لەگەڵ مرۆڤەکاندا، لە باس و بابەتەکانی (مەکتووبات)ن.
٣- (بریسکەکان) ناوی سێیەم کتێبە و لە سیوسێ بریسکە پێک هاتووە. ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بریتییە لە ڕەواندنەوەی چەند گومانێک کە دوای خوێندنەوەی باسەکانی ئەم کتێبە خوێنەر هەست دەکات هیچ کام لە گومانەکانی نەماون!
پاشان چەندین موناجات و پاڕانەوەی زۆر بەرز و بڵند لەخۆ دەگرێت. هەروەها شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر (د.خ) بە شاڕێگەی ژیانی کۆمەڵایەتی و شایانی مرۆڤ دادەنێت و ڕوونی دەکاتەوە کە ئارامیی تەواوەتیی دڵ و دەروون لەو ڕێگەیەدایە.
دواتر خوێندنەوەیەکی ورد و لێکۆڵەرانە بۆ یاساکانی سروشت و دەرخستنی جوانییەکانی ئەو سروشتە و ناساندنی وەکو یاسایەکی کاریگەری خوایی لە بوونەوەردا دەکات کە بەردەوام لە کاردایە، لەگەڵ ئەوەی کە خۆی خاوەنی هیچ ویستێک نییە و بە وێنەی تەختەڕەشی گەردوون وایە کە بەردەوام لە سەری دەنووسرێت و دەسڕدرێتەوە.
پاشان باس لە ڕوونکردنەوەی چەند ئایەتێک دەکات و لێکدانەوەی وردیان بۆ دەکات، هەروەها ڕوونکردنەوەی چەند فەرموودەیەکیش کە مەگەر زانایەکی وەکو مامۆستا نوورسی بەو تێڕامانە جوانە لەو فەرموودانە تێبگەن.
٤- چوارەمین بەرگ لە سەرجەمی پەیامەکانی نوور بە ناوی (تیشکەکان) بڵاو کراوەتەوە و لە پازدە تیشک پێک هاتووە. لە دووتوێی ئەم تیشکانەدا مامۆستا نوورسی باس لە یەکتایی خوای گەورە دەکات و سەلماندنی ئەوەش کە تەنها بە یەکتاناسینی خوای گەورە ژیان مانای دەبێت و دڵ و مێشکی مرۆڤ ئارام دەگرێت. (بینینەکانی گەشتیارێک) کە بەشێکی گرنگی ئەم بەرگەیە، حاڵی گەشتیارێک باس دەکات کە لە نوێ هاتووەتە ناو گەردوونەوە و پرسیار لە یەکبەیەکی پێکهێنەرەکانی گەردوون دەکات و وەڵامگەلێکی دەستدەکەوێت کە

سەعیدی نووری

وا دەکات گەشتیارەکە لە قووڵایی ناخیدا هەست بە حەوانەوەی تەواوەتی بکات و لە ڕێگەی وەڵامەکانەوە تێبگات کە گەردوون هەرگیز بێخاوەن نییە و یەکپارچە بە خۆشەویستی و یارمەتیدانی یەکتریی بەشەکانیەوە بەڕێ دەچێت.

٥- (پاشبەندەکان) ناوی پێنجەم بەرگی کتێبەکانی (سەرجەمی پەیامەکانی نوور)ە کە وەرگێڕ بە زمانی کوردی بڵاوی کرووەتەوە و لە سێ بەشی گەورە پێک هاتووە کە ئەوانیش (پاشبەندی بارلا، پاشبەندی قەستەمۆنی، پاشبەندی ئەمیرداغ)ن. کتێبی پاشبەندەکان ئەو نامانە لەخۆ دەگرێت کە لە نێوان دانەر و قوتابییەکانیدا ئاڵوگۆڕ کران و وەڵامی پرسیارەکانی تێدا داونەتەوە و ڕێنمایی پێشکەش کردوون. هەر وەک چەند بەرگرییەکی تێدایە کە مامۆستا و قوتابیانی لە بەردەم دادگا ئەنجامیان داوە بۆ بەدەستهێنانی ئازادیی بڵاوبوونەوەی پەیامەکانی نوور و لەچاپدانیان بەبێ سانسۆر.

٦- شەشەم کتێب کە بە زمانی کوردی لە چاپ دراوە، ناوی (داوەرییەکان)ی بۆ هەڵبژێردراوە. بە ڕاستی ئەم کتێبە کتێبێکی دەگمەن و جیاوازە! لە چەند بەشێک پێک هاتووە و هەر بەشێکی تایبەتە بە داوەرییە ژیرییەکان و هەڵسەنگاندنی بارودۆخی ڕۆژانەی مرۆڤ و ڕۆشنکردنەوەی ڕێ بۆ ئەوەی لە بچووکترین هەڵوێستدا و لە گەورەترین کێشەدا مرۆڤ تەرازووی ژیری و زانستییانە بەکار بهێنێت و مامەڵەی دروست لەگەڵ بچووک و گەورەدا بکات و ئاکامەکان بە قازانج بشکێنەوە.

هەروەها بەشێکی بریتییە لە مونازەرات و وتووێژ لەگەڵ خەڵکی، بە تایبەت لەگەڵ کوردەکان سەبارەت بە ڕوونکردنەوەی (مەشرووتییەت) کە ئەو کاتە تازە هاتبووە ئاراوە و زۆرێک لە کوردەکان لێی دەسڵەمینەوە و نەیاندەویست پەسەندی بکەن. هەروەها ئەم بەرگە (وتاری شام)ی تێدایە کە بریتییە لەو وتارەی مامۆستا نوورسی کە ساڵی ١٩١١ لە مزگەوتی ئەمەوی لە شام ئاراستەی هەزاران کەسی کردووە کە زیاتر لە سەد زانای گەورەیان لە نێواندا بووە. ئەم کتێبە لە چەند بابەتێکی تر پێک هاتووە کە بریتین لە چەند حاڵەتێکی ڕۆحیی دانەر و چەند ڕوونکردنەوەیەک بۆ ئەو حاڵەتانە.

٧- کتێبی (ئاماژەکانی ئیعجاز) یەکێکە لە شاکارەکانی مامۆستا نوورسی. ئەم کتێبە لە گەرمەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا نووسراوە و تەفسیری چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دەکات. لە پێشەکیی کتێبەکەدا باس لە مەرجەکانی نووسینی تەفسیر دەکات و ڕێسایەکی ناوازەی دەستنیشان کردووە بۆ ئەنجامدانی کاری تەفسیرکردن کە جێی خۆیەتی جیهانی ئیسلامی لێی لانەدەن. لەم تەفسیرەدا وردەکاریی وەهای ڕوون کردووەتەوە کە مرۆڤ دەخەنە سەرسووڕمانەوە لەوەی چۆن ئەم کتێبە بەم چڕی و مەزنییەی لە ناو سەنگەری جەنگدا دانراوە.

٨- ژمارە هەشتی ئەم بەرگانە بەر کتێبی (مەسنەویی نووری) کەوتووە کە هێشتا بە کوردی چاپ نەکراوە. وەرگێڕ لە نووسینەکانیدا خوێنەری پەیامەکانی دڵنیا کردووەتەوە کە لە بەردەستیدایە

و کار لـە وەرگێڕانیدا دەکات و بـە پشـتیوانیی خـوای گـەورە لەگـەڵ ئامادەبوونیدا بـۆ چـاپ بـڵاوی دەکاتـەوە.

٩- دوایین بـەرگ لـە زنجیرەی سـەرجەمی پەیامەکانی نوور بەرگێکی گەورەیە بە ناوی (ژیاننامـەی بەدیعوززەمـان سـەعیدی نوورسـی) کـە بـە کـوردی بـڵاو کراوەتـەوە.

بێگومـان بابەتـی سـەرەکی لـەم کتێبـی ژیاننامەیـەدا دەرخستنی قۆناغەکانـی ژیانـی مامۆسـتا نوورسـییە هـەر لـە منداڵییـەوە تـا دواسـاتەکانی ژیانـی و بەشـێکی زۆر لـەو بەرگرییانەشـی تێدایـە کـە لـە دادگاکانـدا پێشکەشـی کـردوون و زۆرێـک نامـەی تێدایـە کـە پەیوەنـدن بـە قۆناغەکانـی ژیانیـەوە.

لێـرەدا بـە پێویسـتی دەزانیـن ئـەو کتێبانـەی تریـش (بێجگـە لـە بەرگـە گـەورەکان) کـە تـا ئێسـتا بـە زمانـی کـوردی بـڵاو کراونەتـەوە، زۆر بـە کورتـی بە خوێنـەری بەڕێز بناسـێنین. ئـەم کتێبانـە هەریەکەیـان بەشـێک یاخود چەند بەشـێکن لـە کتێبە گـەورەکان و دانەریـان بـەو جـۆرەش بـڵاوی کردوونەتـەوە. بـۆ نموونـە (وتـەی دەیـەم) لـە کتێبـی (وتـەکان) نـاوی (پەیامـی حەشـر)ە و بـە سـەربەخۆش بـڵاو کراوەتـەوە.

لـە مـاوەی وەرگێڕانـدا بـۆ زمانـی کوردی، وەرگێڕ تا ئێسـتا سیوپێنج کتێبـی لەمانـە چـاپ کـردووە. بـۆ ئاشـنابوونی خوێنـەر پێیـان، لێرەدا ناوی هەندێکیان دەهێنین: پەیامـی بیمـاران، پەیامـی پیـران، وتـە بچووکـەکان، سروشـت هونـەرە یـان هونەرمەنـد؟ مەلائیکـەت و ژیانـی دوارۆژ، پەیامـی ڕەمـەزان، پەیامـی ئیخـلاس و برایەتـی، مـرۆڤ و ئیمـان، بـەری دەرختـی ئیمـان، موعجیزاتـی ئەحمـەدی، پەنجـەرەکان، پەیامـی حەشـر، مـن... خـودی مـرۆڤ و بزووتنـی گەردیلـەکان، ڕابـەری لاوان، ڕابـەری خوشـکان، ڕابـەری خزمەتگوزارانـی قورئـان، ڕاستیی تەوحید، ڕاستییەکانی ئیمان، شـوکرانەبژێری، بینینەکانـی گەشـتیارێک، موعجیزاتـی قورئانـی، سوننەتی پێغەمبەر پلیکانە و ڕێبازە، موناجات، وتاری شـام، مونـازەرات، بڕوانامـەی هـەردوو قوتابخانـەی موسـیبەت، گزنگـەکان... ئامـاژەکان... هێمـاکان... هتد.

ماوەتـەوە بڵێیـن: ئـەم وەرگێڕانـە کوردییانـە زۆر بـە وردی و دڵسـۆزی ئەنجام دراون. چونکە بۆ دڵنیایی لـە وردیـی ئـەو کارە، دوای وەرگێڕانـی هەمـوو کتێبێـک و پێش لەچاپدانی، یەکەم شت لەگەڵ دەقە عەرەبییەکەیـدا، پاشـان جارێکـی تـر لەگـەڵ دەقـە تورکییەکەیـدا بـەراورد کراوەتـەوە گـەر ئەسـڵەکەی تورکـی بووبێـت. دواتر چەند جارێک ئـەم کوردییە لـە لایـەن چەنـد شـارەزایەکەوە و بـەراورد کـراوە، لـە ڕووی زمانەوانـی و داڕشـتنەوە خوێنراوەتـەوە و پێداچوونـەوەی بـۆ کـراوە و ڕێکسـازیی لاپـەڕەکان و فۆنـت و قەبـارەی فۆنـت و وردەکاریـی تـری پێـش لەچاپـدان بۆیـان ئەنجـام دراون. بۆیـە بـە چاپێکـی نایـاب و ڕێـک و قەشـەنگ و کەموێنـە لـە کتێبخانـەی کوردیـدا کەوتوونەتـە بەردەسـتی خوێنەریـان.

بەڵـێ، ئەسـتێرە ڕێنیشـاندەرەکەی باکـوور، ڕووناکییەکـەی لـە کوردسـتانی باشـووردا پرشـنگ دەدات و شـایانی هەنگاونانـی سـوودوەرگرتنە لـە ڕووناکییەکـەیدا.

نەتـەوەی کـورد مافـی خۆیەتـی شـانازی بـە زانایەکـی ئـاوا نـاوازەی خۆیـەوە بـکات و وەکـو نەتەوەکانـی تـر کـە سـوودیان لـێ بینیـوە، ئەمیـش زیاتـر پێـی ئاشـنا ببێـت و بیـکات بـە سـەرمەشقی خـۆی.

سەعیدی نوورسی

# جوانبینیی سەعیدی نوورسی

موسعەب ئەدهەم

**جوانبینی و جوانیناسی:**

یۆنانییەکان و ڕۆمییە دێرینەکان سێ شتیان بە هۆکار و مایەی ئارامی و ئاسوودەیی مرۆڤەکان زانیوە، یەکەم: «ڕاستی» یان «حەقیقەت»، دووەم: «خێر» یان «چاکە»، سێیەم: «جوانی» یان «جمال».

گەڕان بەدوای حەقیقەتدا لە مێژووی مرۆڤایەتیدا «زانست»ی دروست کردووە. گەڕان و بەدووکەوتنی «خێر»، «ئەخلاق»ی لە نێوماندا پێک هێناوە و دروست کردووە و گەڕانیش بەدوای «جوانی و جوانیبوون»دا بووە بە هۆی دروستبوونی «هونەر». ئەوەی فەلسەفە لەبارەی هونەرەوە دەتوانێت بیڵێت، «حەقیقەتی جوانی»یە و ئەوەی هونەر دەتوانێت لەبارەی فەلسەفەوە بیڵێت، «جوانیی حقیقەت»ە. ئەمەش دەشێت جیهانبینییەکی سەربەخۆ بێت بۆ خۆی ئەگەر بوون بە جوان بزانین و مرۆڤ بە بوونەوەرێکی جوانیپەرست مانا بکەین، ئەو کاتە سەرمایەیەک بە ناوی عیشقەوە بە دەست دەهێنین کە دەتوانێت جیهانێکی نوێ و مرۆڤێکی دیکە دروست بکات. لە دیدگای جوانیناسییەوە بوون جوانە و دروستکەرەکەشی ڕەهای جوانی و جوانیی ڕەهایە. عیشق یاسایەکە کە بەسەر بووندا فەرمانڕەوایە و مرۆڤەکان بە هۆی بێئاگاییەوە و لادان لە جوانییەکان مجور ماونەتەوە و عیشقیان نادیدە وەرگرتووە و بە هەمان ئەندازەش گرفتاری بەڵا بوون. تەنانەت دەشێ فەلسەفەی بوون بە کلیلەکانی وەکو جوانی و عیشق بکرێنەوە. ئەو کاتە بە نیگایەکی نوێوە بە جیهان دەگەین،

به گوتەی سەعدی شیرازی:
به جهان خرم از انم که جهان خرم ازاوست
عاشقم بر همه عالم که همه عالم ازاوست
تەنانەت بەم جۆره نیگا و ڕوانینە دەتوانرێت مانا بە ژیان ببەخشرێت و ڕێگەی عیشقی ئاسمانیش بدۆزینەوە و ئامانجی ژیانیش بدۆزینەوە: (حافز) گوتەنی:
مراد دل ز تماشای باغ عالم چیست ؟
به دست مردم چشم از رخ توگل چیدن
مەعنەوییەتگەرا و و فەیلەسوف و عاریفی ناوداری سویسی «فریتیوف شوان» لە بنەماکانی جوانیناسیدا دەڵێت: تەریقەت چوار لایەنی سەرەکی دەگرێتەوە، لایەنی تیۆری، کە ئامۆژه و فێرکاری شایەدیی بۆ دەدات. لایەنی ئیرادی یان تەکنیکی، کە ئامرازەکان و هۆکاره ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆکانی ڕێگە «طریق» دەگرێتەوە. لایەنی ئەخلاقی کە پەیوەستە بە فەزیلەتە ناوەکی و دەرەکییەکانەوە و لایەنی جوانیناسانە کە ڕەمززانی و هێماکاری و هونەره کە هەم لە ڕووی زەینی و هەم لە ڕووی عەینییەوە بەوەوە وابەستە و پەیوەستن. جوانی لە ڕووی دەرەکییەوە، پیشاندەری بەخشین یان نەبەخشین، یان دەستەواژەیەک لە ئاییندارى و لەم ڕێڕەوەشەوە ڕوونکەرەوەی جۆرێک ڕەمزکاری و هێماکاریی ئیلاهیاتییە. لە ڕووی ناوەکی «باطن»یشەوە لە پەیوەندی لەگەڵ چاودێری «مراقبە» و یادکردنەوە «ذکر»ی شاراوە،

ڕۆڵ و ئامرازی مەعنەوی هۆکاری مەعنەوی دەگێڕێت. مەبەستیشمان لە «جوانیناسیی تەواو - زیباشناسی کامل» لە ڕاستیدا زانستێکە کە نەک تەنها گرنگی بە جوانیی هەستپێکراو دەدات، بەڵکو گرنگی بە بنەما مەعنەوییەکانیش دەدات. ئەم بنەمایە ڕوونکەرەوەی پەیوەندیی هەمیشەیی هونەرەکان و شێوەکانی هەنگاونان بەرەو سەیر و سلوکن.١

**عیرفان و جوانبینی**

بیریار و فەیلەسوفی ناودار (د. عەبدولکەریم سروش) لە (حیکمەت و مەعیشەت)دا دەڵێت: عیرفان واتە توانای بینینی جوانی لەم جیهانە و جوانبینین و جوانکارکردن.٢
یەکێک لە قوتابخانە گەورەکان لە عیرفانی ئیسلامیدا، قوتابخانەی جوانیپەرستی یان جوانیناسیی ناوە کە لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە بە (ئەبوو حیلمانی فارسی) دەستی پێ کردووە و لە ڕووی بوونناسی و مەعریفەتناسی و لەسەر بنەمای

سەعیدی نووری

جوانی و «جمال» ڕاڤەی بوون ڕوون دەکاتەوە. لەم دیدگایەدا خودا جوانە و هەرچییشی دروست کردووە جوانە، لە لایەکی تریشەوە بوون جیلوە و دەرکەوتەی جوانی و «جمال»ی هەقە و شتێکی تر جگە لە ئەو و جوانیی ئەو کە لە ئاستی جیاواز جیاوازدا جیلوەی کردووە و دەرکەوتووە، بوونی نییە.٣

لای عاریفی گەورە و باوکی عیرفانی ئیسلامی «محی الدین العربی» پەیوەندییەکی پتەو لە نێوان عیشق و جوانیدا هەیە. عیشق بە خودی خۆی بە بەهایەکی سەربەخۆ ناژمێردرێت. بونیادی عیشق جوانییە. خودای گەورەش بە هەموو جوانییەکانییەوە لە جیهاندا تەجەللای کردووە و دەرکەوتووە، لەبەر ئەمەشە مرۆڤ خودای خۆش دەوێت. سەرچاوەی جوانییە مادییەکانیش خودایە؛ واتە شێوە و وێنەی جیهان و هەر لەبەر ئەوەشە جوانییە مەعنەوییەکانیش وەکو زانست، مەعریفەت و ئەخلاق ڕیشەیەکیان لە جوانی و دەرکەوتەکانی خوادا هەیە. بەڵام مرۆڤیش جوانە و خەلیفەی خوایە لە سەر ڕووی زەوی و خودای گەورە خۆی فەرموویەتی: [لقد خلقنا الانسان فی احسن تقویم] و دەرکەوتە و تەجەللای خودا بە باشترین شێوە دەردەکەوێت. ئەم عیرفان و جوانبینییەش لە خودی ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە. بە پێچەوانەی هەندێک لەو نووسەر و لێکۆڵەرانەی کە لە ئەدەبیاتی کوردیشماندا بۆنی ئەم گوتەیە لە نووسین و توێژینەوەکانیاندا هەست پێ دەکرێت و ڕەنگی ئەو قسەیەی کە دەوترێت عیرفان لە دەرەوەی ئایینی ئیسلامە لە نووسین و قسەکانی ئەوانیشدا ڕەنگوبۆیەکی هەیە و ددانیان پێدا ناوە.٤

ئەگەر لە کایەیەکی گەورەی وەکو زانستی ئەخلاق و فەلسەفەی ئەخلاقدا پێوەرەکان ئەخلاقی بن، بۆ نموونە مرۆڤ دەبێت ڕاستگۆ بێت و ڕاستگۆیی بکاتە پیشە و درۆ نەکات، ئەوە لەبەر ئەوەیە ڕاستگۆیی شتێکی ئەخلاقییە و درۆنەکردن بابەتێکی نائەخلاقی و کارێکی ناپەسەندە. بەڵام لە عیرفاندا پێوەر ئەخلاقی و نائەخلاقی نییە، بەڵکو شتێکە لە سەرووی ئەخلاقەوە کە ئەویش بابەتی جوانی و پێوەری جوانبینییە، بۆیە لای عاریفان و دونیای عیرفاندا، مرۆڤ لەبەر ئەوەی ڕاستگۆیی دەکاتە پیشە و لە درۆ دوور دەکەوێتەوە، چونکە ڕاستگۆیی جگە لەوەی بابەتێکی ئەخلاقییە، ئەوا شتێکی جوانە و درۆکردنیش شتێکی ناشیرین و کردەوەیەکی ناجوانە و ڕۆحی بریندار دەکات.

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی عاریفان و عیرفان بە گشتی بریتییە لە جوانبینی و هەستکردن بە جوانییەکان، بە جۆرێک، دەشێ بوترێ یەکێک لە پایە و بنەماکانی عاریفان و عیرفان بریتییە لە جوانبینی و جوانیناسی. تەنانەت هەندێک لە عاریفان بە جوانیپەرست یان جوانپەرست ناوبانگیان دەرکردووە و ناسراون، نموونەی ئەمانەش، کەسانی وەکو ئیبن عەرەبی و ئەحمەد غەزالی و...

ئەگەر عیرفانی ئیسلامی بە گوتەی (مارتین لینگز) ی شکسپیرناس و عاریفی بەناوبانگی سەردەمی نوێ ئەو ئاوە بێت کە بەردەوام شەپۆل دەدات و بەرز و نزم دەبێتەوە و دەریائاسا بێت کە لە کاتی بەرزبوونەوە و دروستبوونی شەپۆلەکاندا بۆ دوورترین شوێنەکان دەڕوات و لە کاتی گەڕانەوە و نیشتنی ئەو شەپۆلانەدا هەموو ئەو چاڵانە پڕ دەکاتەوە کە لە کەنارەکانیدا دروست بوون،٥ ئەوا مرۆڤەکان یان عاریفان بەپێی گەورەیی و بچووکیی ڕۆحیان پڕ دەبن لە ئاوی دەریا و بەمەش هەر کەسە و هێندەی بوون و ڕۆحی خۆی لەو دەریایەدا ئاو نۆش دەکات و (مەولەویی تاوەگۆزی) گوتەنی:

هەر کەس بناڵو وەقەد ناڵەی ویش
هەر کەس بنوشۆ وەپیاڵەی ویش

واتە:

ئیدی لێرەوە هەر عاریفێک و ڕۆحمەزنێک هێندەی گۆزەی ڕۆحی خۆی لەو دەریای مەعنەوییەت و عیرفانە تێرئاو دەبێت و ڕۆحی مەزن دەبێت و پەیوەست دەبێت بە دەریاوە.

**نوورسی و جوانبینی:**

لێرەوە دەشێ بچینە نێو جیهانی ڕۆحمەزنێکی وەکو (سەعید نوورسی) و لە جیهانی ئەوەوە، وەکو عاریفێک، جوانبینی پیشان بدەین. بێگومان (نوورسی) عاریف بووە بە مانای عاریف. ئەگەر تایبەتمەندی و سیفەتە سەرەکییەکانی عاریفان پێوەر بن بۆ کەسی عاریف، یان مرۆڤی عاریف و

ناعاریف جودا بکەینەوە کە زۆرێک لە عاریفان و لێکۆڵەرەوانی بواری عیرفان و مەعنەوییەت ئاماژەیان پێ کردوون، ئەوا ئەم سیفەتانە ئەمانەن:
١- ڕازئامێزبوون.
٢- فراوانی.
٣- کەشفکاری مرۆڤەکانی.
٤- زیندوویێتی.٦
بەو پێوەرانە، ئەم پیاوە کوردەی مێژووی شارستانییەتی ئیسلامی و فەرهەنگی کوردیمان عاریف بووە بە مانا ڕاستەقینەکەی. هەرچەندە ئەو پێیەکی لە نێو دەرکەوتنی دونیای نوێ و مۆدێرنەدا بووە و پێیەکەی تری لە نێو دونیای پێش مۆدێرنە و جیهانی پێش مۆدێرنە، بەڵام توانیویەتی وەکو عاریفێک بژی و ژیان بکات، لە کاتێکدا سەردەمناسەکانی دونیای نوێ و بیرمەندانی مۆدێرنە باوەڕیان وایە سەردەمی نوێ سەردەمی دروستبوونی عاریف بە ماناکەی پێشوو نییە و عاریف لەم سەردەمەدا بوونی نییە یان دروست نابێت.
ڕێبازی من دەربڕینی خۆشەویستیە بۆ (خۆشەویستی) و دەرخستنی ناحەزییە بۆ (دوژمنداری)... واتە لای من خۆشەویسترین شت لەم جیهانەدا (خۆشەویستییە)... ناخۆشترین و ناپەسەنترین شتیش لای من ناحەزی و دوژمنایەتی و دژایەتییە.٧
ڕوانگەی نوورسی بۆ جوانی تەنها لە جوانیی ڕووکەشیدا کورت نابێتەوە کە پەیوەستە بە چاوەکانەوە، بەڵکو پەیوەستە بە جوانیی ڕەها «مطلق»ەوە و ئەو جوانییەش لە هەموو توخمەکانی بووندا هەیە لە گەورەوە تاکو گچکەترینیان، هەروەها جوانیی لە هەموو تونخمەکانی بووندا دەرخستووە و جیلوە پێ کردووە گەرچی گەلێک بچووکیش بن و ئەمەش بە ددانپێدانان بە خاوەن جوانیی ڕەهادا دەردەکەوێت و نومایان دەبێت. چونکە (نوورسی)یش هەروەک عاریفانی تر پێیان وایە بوون و دروستکراوەکانی وێنەدانەوە و جیلوەی جوانیی خوداییێن، (فەروغی بەستامی) لە دوو دێڕەشیعری جواندا ئاماژەی بۆ ئەمە کردووە و دەڵێت:
کی رفته‌ای ز دل که تمنا کنم تو را
کی نهفته‌ای زل که پیدا کنم تو را
با صد هزار جلوه برون امدی و من
به صد هزار دیده تماشا کنم تو را
واتە: «کەی لە دڵ ڕۆیشتووی تاکو ئارەزووت بکەم، کەی لە دڵ شاراوە بوویت تاکو بتدۆزمەوە، بە سەد هەزار جیلوە خۆت دەرخست و دەرکەوتی، منیش بە سەد هەزار دیدە و نیگاوە سەیرت دەکەم.»
بۆیە لە (پەیامەکانی نوور)ی ئەم عاریفەدا بوون، دەرخستن و پیشاندانی دروستکراوەکانی خودایە و جوانی و وردیی دروستبوونیشیان، وێنەی جوانیی خوداییێن.٨
دەبینین ڕوانینی عاریفانەی (نوورسی) زۆر باش نومایان دەبێت و هەمان ئەو خاڵە هاوبەشانەی لای عاریفان و مەعنەوییەتگەرایان و مرۆڤە ڕۆحانییەکانی لە هەر شوێنێکی ئەم سەرزەمینەدا هەیە، لای (نوورسی)یش هەست بە بوونیان دەکرێت و لە ئەزموونی ڕۆحیی ئەویشدا نەک هەر جێگەیەکیان هەیە، بەڵکو بەشێکن لە ئەزموونی ئەو.
ئەزموونە عیرفانییەکانی کە جوانی و جوانبینیان لێ دەچۆڕێت، لای ئەم پیاوە کوردە شایەنی ئەوەن بگوازرێنەوە و ئێمەی نیشتەجێبوانی سەردەمی نوێ و تەکنۆلۆژیا و دونیای مادیگەری سوود و کەڵکیان لێ وەربگرین و بتوانین هیچ نەبێ ئازاری ڕۆحی خۆمان و مرۆڤە ئازاراوییەکان کەم بکەینەوە، کە دیارە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی سەردەمی نوێ زۆرتربوون و زێدەتربوونی ئازارە ڕۆحی و دەروونییەکانە.
(نوورسی) دەڵێت: من هەشتاهەزار مامۆستام هەیە! کەسێک چۆن دەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات هەشتا هەزار مامۆستای ببێت؟ ئەگەر تەمەنیشی هەشتاهەزار ساڵ بووبێت، ئینجا

سەعیدی نوورسی

دەتوانێت هەشتا هەزار مامۆستای هەبێت! بەڵام مامۆساتاکانی (سەعید نوورسی) مامۆستای ئاسایی نین، مامۆستاکانی (نوورسی) مامۆستایانێکن کە تەنانەت (بە تەعبیری خۆی) مێشیش مامۆستای بووە! کە مێش هەمیشە خەریکی پاککردنەوەی خۆیەتی. جیهانی (سەعید نوورسی) زۆر فراوانترە لەو جیهانەی کە هەر کام لە ئێمە هەستی پێ دەکەین، جیهانێک کە لە یەک چرکەدا هەشتاهەزار مامۆستای لە بەرچاوی ئەو هەبووە و لە ڕۆحی ئەودا حزووری بووە.٩

یاخود ئەو مامەڵە شهودی و سەیرەی کە ڕەنگە تێگەیشتنی بە لای ئێمەی سەردەمی نوێوە سەخت بێ، چ ئەنجامدانی ئەو کارانەی ئەو و مامەڵەکردنی لەو جۆرە، وەک ئەوەی لە ماوەی (٢٠) خولەکدا کتێبێکی سەد لاپەڕەیی نووسیوە، جار هەبووە بە دوو سەعات کتێبێکی سەدوسی لاپەڕەیی، دووسەد لاپەڕەیی و سێسەد لاپەڕەیی نووسیوە! ئەوە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی سەردەمی پێش مۆدێرنە و مامەڵەی (شهودی) لەگەڵ شتەکاندا.١٠

یاخود هاوڕێیەتی و دراوسێیەتی لەگەڵ ئاژەڵان و بوونەوەرانی تر، وەک ئەوەی کە دراوسێیەتی لەگەڵ مێروولەدا کردووە و بەشی خۆراک و خواردن داوە و مامەڵەی لەتەکدا کردووە، هەر وەک ئەوەی لای عاریف و شاعیرێکی وەکو (سوهرابی سپهەری) ئەم جۆرە مامەڵانە دەبینین و لە باسی ژیاننامەیدا هاتووە، یارمەتیی مێروولەکانی داوە و چیلکەداری لە سەر ڕووی ئاوەکان بۆ داناون تاکو نەخنکێن. ئەمانە هەموو ئەوەمان پێ نیشان دەدەن ئەم پیاوە بە هۆی ئەزموونی قووڵ و ڕۆحانیبوونیەوە چەندە جوانبین بووە و جوانبینییش کە تایبەتمەندی و یەکێکە لە سیفەتەکانی عاریفان و ڕۆحانییەکان، لەم پیاوەدا حزووری هەبووە.

هەروەها کۆمەڵە تایبەتمەندییەکی دیکە کە تایبەتمەندی و سیفاتی عاریفان و کەسە ڕۆحانییەکانن، لەوانە، ڕازئامێزی و هەبوونی ڕاز، وەک ئەو ڕووداوەی کە لە ژیانی (نوورسی)یدا باس دەکرێ کاتێک قوتابییەکی هەبووە بە ناوی «حەبیب» و ئەم قوتابییەی هەموو شەوێک لە نوێژی بەیانیدا دێتە لای (نوورسی) و وانە دەخوێنێت، ئەمەش لەبەر ئەوەی بە نهێنی قوتابی بووە و ترسی هەبووە لە ڕۆژدا کێشەی بۆ دروست ببێت، بۆیە لەو کاتانەدا دێتە خزمەتی ئەم عاریفە. شەوێکیان زووتر دێت و سەیر دەکات (نوورسی) خەریکی پاڕانەوە و نزاکردن و ڕاز و نیازە لەگەڵ پەروەردگاردا، بۆیە (نوورسی) هەر خەریکی نزا و موناجاتی خۆیەتی و کاردانەوەی بەرامبەر بەم قوتابییەی نابێت، دوای ڕاز و نیازەکەی، بە (حەبیب)ی قوتابی دەڵێت، من ڕازیم تەنانەت (حەبیب)ێکی وەکو تۆش بکەوێتە نێوان خۆم (حەبیب)ەوە، کە مەبەستی خوای گەورەیە کە مەعشوق و مەحبوبی ڕاستەقینەیەتی.

ئەمانە و چەندین نموونە و نهێنیی دیکەی ژیانی ئەم عاریفە مەزنەی کورد کە ئەگەر لەبەر کوردبوونی نەبوایە، زۆر ناسراوتر دەبوو لەوەی کە ئێستا هەیە. دیارە لە وتارێکی کورتی وەکو ئەم بابەتەدا ناتوانین ئەزموونە قووڵ و جوانبینییەکانی ئەم پیاوە باس بکەین. ئاخر پەیامەکانی ئەو کە سەدوسی کتێبن، لە ماوەی نزیکەی بیستوچوار ساڵدا و لە نێوان ساڵانی (١٩٢٦-١٩٥٠) نووسیوونی.١١

بۆیە پێویستمان بە (نوورسی)ناسان و لێکۆڵەرەوانی

تر و زێدەتر هەیە لەم بوارەدا، هەر وەک ئەوەی لە وڵاتی (تورکیا)دا ساڵانە کۆنفرانسی گەورەی بۆ ئەنجام دەدرێت و تیشک دەخرێتە سەر تانوپۆ و بەرهەم و بیری ڕۆشن و جوانی ئەم عاریفەی مەزنەی کورد، بەو ئومێدەی ئەم بابەتە چکۆلەیە توانیبێتی پەنجەرەیەکی گچکە لە دەروازەی جوانبینییەوە بە ڕووی دونیا جوان و قەشەنگەکەی (نوورسی)یدا بکاتەوە، دونیایەک جگە لە شادیی ڕۆحی و چنینەوەی مروارییە جوانەکان و ئاوەدانکردنەوەی ڕۆح شتێکی دیکەی تێدا نییە.

**سەرچاوە و پەراوێزەکان:**


١- گۆڤاری هەژان، ساڵی ٢٠١٠، ژمارە ٢٥، لە وێنەوە بۆ مانا، موسعەب ئەدهەم.
٢- عیشقی گەورەتر لە عیشق، موسعەب ئەدهەم، چ٢، ٢٠١٠.
٣- عرفانی جمالی، د. علی اکبر افراسیاب پور، انتشارات ترفند، چاپ نخست، ١٣٨٦، ص ٤٦-٤٧.
٤- گۆڤاری هەژان، ساڵی ٢٠١٠، ژمارە ٢٥، لە وێنەوە بۆ مانا، موسعەب ئەدهەم.
٥- عرفان اسلامی چیست؟ مارتین لینگز، ترجمە: فروزان راسخی، نشر سهروردی، تهران، چاپ اول، ١٣٨١.
٦- تەحسین حەمەغەریب، گۆڤاری هەژان، ژمارە «١٧-١٨» لا ٩٢.
٧- سەعید نوورسی، سەلاحەددین موحەممەد، چاپی یەکەم، لا ١٧٧، ٢٠١٦.
٨- الوظيفة الايمانية و الاخلاقية للنظر الجمالي في رسائل النور، ا.د. عمار جيدل، ص ١٧٦-١٧٧. الجمالية في الفكر الاسلامي المعاصر، سوز للطباعة و النشر، الطبعة الاولى، ٢٠٠٦م.
٩- تەحسین حەمەغەریب، گۆڤاری هەژان، ژمارە «١٧-١٨»، لا ١٠٦.
١٠- تەحسین حەمەغەریب، گۆڤاری هەژان، ژمارە «١٧-١٨»، لا ١٠٢ و ١٠٣
١١- تەحسین حەمەغەریب، گۆڤاری هەژان، ژمارە «١٧-١٨»، لا ١٠٢ و ١٠٣.


سەعیدی نوورسی

# شێخ محەممەدی خاڵ و ناساندنی سەعید نوورسی

**عەلی حەمەڕەسووڵ**

«زۆر دەمێک بوو دەنگوباسی زانایی و بلیمەتیی ئەم هەڵکەوتووەم دەبیست، بەڵام هەرچەندم ئەکرد ژیان و بەسەرهاتیم نەئەزانی، تا چەند ساڵێک لەمەوپێش نامیلکەیەکم لە ژیانی ئەم دانایە بە قەڵەمی مامۆستا محەممەد سەعید ڕەمەزان بووتی بە دیاری بۆ هات کە لە ساڵی ١٣٨٤ه-١٩٦٤م لە چاپخانەی جەزائیر لە شام چاپ کراوە. منیش بەشی زۆریم وەرگێڕایە سەر زمانی کوردی بەبێ دەستکاری.»
ئەمەی سەرەوە دەقی دەسپێکی مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵە بۆ وەرگێڕانی ئەو نامیلکەیەی کە ئاماژەی پێ کرد.
نامیلکەی ناوبراو نووسەرەکەی خوالێخۆشبوو پ. د. محەممەد سەعید ڕەمەزان بۆتانییە (١٩٢٩-٢٠١٣/٣/٢١) کە زانایەکی ناوداری کوردە و دەستی تیرۆر لە ڕووداوەکانی ئەم ساڵانەی سووریادا کۆتایی بە ژیانی هێنا. زیاد لە چل دانراوی بەهێز و توندوتۆڵی لە بابەتە هەستیارەکانی ئایینی ئیسلامدا بە ڕێبازێکی زانستییانەی بەرز و بە دارشتنێکی ئەدەبیی درەخشان نووسیوە. «مەم و زین»ی خانی و «داستانی خەج و سیامەند»ی بە پەخشانێکی ناوازە بە زمانی عەرەبی داڕشتووەتەوە.

ئەو نامیلکەیەشی بە زمانی عەرەبی و بە مەبەستی ناساندنی زانای گەورەی گەلی کورد «سەعیدی نوورسی» بە خوێنەرانی زمانی عەرەبی نووسیوە و چەند جارێک -چ لە شێوەی نامیلکەدا و چ لە شێوەی وتاری ناو گۆڤاردا- بڵاوی کردووەتەوە.

خوالێخۆشبوو مامۆستا شێخ محەممەدی خاڵ کاتێ ئەو نامیلکەیەی بە دەست دەگات، ئاواتەکەی دێتە دی و زانیاریی لەسەر بەدیعوززەمان بە دەست دەهێنێت. بەوەشەوە ناوەستێ، بە پەخشانێکی جوان دەیکا بە کوردی.

ئەم بەرهەمە کوردییەی مامۆستای خاڵ، مامۆستا فارووق ڕەسووڵ پیاچوونەوەی بۆ کردووە و پێشەکی و ڕوونکردنەوە و پەراوێزی پێویستی بۆ نووسیوە کە ئاسانکاریی باش بۆ خوێنەر دەکات.

مامۆستای خاڵ چەند ساڵێک پێش وەفاتی داوا لە مامۆستا فارووق ئەکات کە بەو بەرهەمەدا بڕواتەوە و تێبینییەکانی پێ بڵێت. ئەویش داواکارییەکەی بۆ جێبەجێ دەکات و تێبینییەکانی بۆ دەنووسێت. دوای کۆچی دوایی مامۆستای خاڵ، لایەنی بڵاوکاریش (نووسینگەی تەفسیر لە هەولێر) جارێکی تر پێشنیازیان بۆ کردووە کە پیاچوونەوەی بۆ بکاتەوە. بۆ ئەم پیاچوونەوەوەیەی دوایی، لەبەر ئەوەی پشتی بە سەرچاوەی زیاتر و تازەتر بەستووە، وردەکاریی زیاتری تیا کردووە.

ئەو تێبینییانەش ڕاستکردنەوەی هەندێ ڕێکەوت و چەمک و جیاوازییەکانی نێوان دەقە عەرەبییەکە و وەرگێڕانەکەی خوالێخۆشبوو مامۆستا خاڵن کە لە پێشەکی و پەراوێزدا خراونەتە ڕوو.

شێخی خاڵ لە ساڵەکانی حەفتادا هەوڵی چاپکردنی داوە، بەڵام وەزارەتی ڕۆشنبیریی ڕژێمی پێشوو ڕێی پێ نەداوە.

مامۆستای خاڵ لەم بەرهەمەیدا دوای وەرگێڕانەکەی، دەقی ئەو بەشە عەرەبییەی ئەسڵەکەشی هێناوە کە تەرجەمەی کردووە.

مامۆستا فارووق لە لاپەڕەکانی کۆتایی ئەم بەرهەمەدا بە کورتی چەند دێڕێکی لەسەر ژیانی هەردوو مامۆستای دانەر و وەرگێڕ نووسیوە. ئەم بەرهەمە نموونەیەکی پەخشانی وەرگێڕانە بە خامەی مامۆستای خاڵ.

# خوێندنەوەیەکی نەرم بۆ کار و فکری سەعیدنوورسی

**حەسەن مەحمود حەمەکەریم**

هەرکات ناوی سەعیدی نوورسی دەبیستم، وێنەی تەقینی کانیاوێکی سازگار دێتە یادم لە بیابانێکی قەحت و وشکدا کە هیوای ژیانی تیا نەمابێت، یا دەرکەوتنی مانگی چواردە لە شەوەزەنگێکی ئەنگوستەچاودا کە هیوا نەمابێ ڕۆشنایی ببینەوە. لە سەرەتای هەشتاکانی سەدەی بیستدا ئێمە لە ڕێکخستنەکانی برایان لە هەڵەبجە لەبەر خراپیی دۆخەکە و ستەمی ڕژێمی بەعس بیرمان کردەوە واز لە شێوازی ڕێکخستنی برایان و کتێبەکانی سەید قوتب و ئیمام بەننا بهێنین، خەریکی ئیمانیات و ناخی خۆمان بین. هاتە بیرمان کە باشترین کار بۆ ئەم قۆناغە کتێبە ناسکە ئیمانییەکان و پەیامەکانی نوور و فکری سەعیدی نوورسی و مەسنەویی مەعنەویی مەولانای ڕۆمییە. ماوەیەک بوو مامۆستا ئیحسان قاسم صالحی لە برایانی موسڵ بە تەرجەمەکردنی ڕەسائیلی نووری نوورسییەوە خەریک بوو لە تورکییەوە بۆ عەرەبی، زۆری لێ بە چاپ گەیاند، هەموو جار باوەشێ لەو کتێبانەی بۆ ئێمە دەنارد بۆ هەڵەبجە و دابەش دەکرا و بە شێوەیەک

دەمانخوێندەوە کە ئەمڕۆ لای من بێ و سبەی لای یەکێکی تر. لەزەتی زۆرمان لێ دەبرد.
ڕۆژێک مامۆستا ئیبراهیم ڕیشاویی ڕەحمەتی کتێبێکی تەرجەمەی نوورسی بۆ هێنام بە ناوی (مشاهدات سائح يسئل الكون عن خالقه). کتێبێکی فەلسەفیی ورد و قورس بوو، چەند جار خوێندمەوە و لێی حاڵی نەبووم، بەو داخەوە خەوتم. ماڵمان یەکەم خانووی گەڕەکی کانی عاشقان بوو لە هەڵەبجە، لە خەوما تەقە لە دەرگا درا، گوڵزاری خوشکم چوو بەدەمییەوە و هاتەوە وتی مامۆستایەکی نوورانی لە بەر دەرگایە تۆی دەوێ، منیش خۆم کۆ کردەوە و ڕۆیشتم، دەبینم مامۆستا سەعید نوورسییە لە شەمەندەفەرێکدا دانیشتووە بە کڵاو و مشکییەکی ڕەش و قاتێکی مراخانییەوە بەو جۆرەی کە وێنەیم لە کتێبەکاندا بینیبوو. خێرا دەستیم ماچ کرد و وتم قوربان فەرموو دابەزە لە خزمەتدا بین، فەرمووی نا نەخێر، تۆ وەرە سەرکەوە با بڕۆین، بزانم بۆ لەو کتێبەم تێناگەیت؟ بە شەمەندەفەر چووین بۆ گولانی شێخ مۆمن و باخی شێخ وەلی لە پشتی هەڵەبجە کە هاوینەهەوارێکی تەڕ و پاراو و پڕ باخ و بێستان و گوڵ و گوڵزار بوو. لەسەرخۆ باسی کتێبەکە و پەیوەندیی ڕاستەوخۆی گیا و گوڵ و مێروو و ئاووهەوا و خۆر و مانگ و سروشتی بە خواوەی بۆ کردم بە شێوازی کتێبەکە و بۆی شی کردمەوە، پاشان بە قیتارەکە هێنامیەوە بۆ ماڵەوە. کە خەبەرم بووەوە، کتێبەکەم هێنا، مامۆستا نوورسیم دەبینی بە دەنگی خۆی بۆم دەخوێنێتەوە، پاشان چووم بۆ لای مامۆستا ئیبراهیم ڕیشاوی و خەوەکەم بۆ گێڕایەوە. مامۆستا کە چوو بوو بۆ کەرکووک بۆ لای مامۆستا ئیحسان، ئەو پرسیبووی جا ئەو برایانە لەم پەیامانە تێدەگەن؟ ئەویش وتبووی ئەگەر لە شتێک تێنەگەین، مامۆستا نوورسی خۆی بە قیتار دێت بۆ هەڵەبجە و تێمان دەگەیەنێ، هەقایەتەکەی منی بۆ گێڕابوویەوە. مامۆستا ئیحسان وتبووی حەز دەکەم ئەم جارە کە هاتی بۆ موسڵ، ئەو برادەرە لەگەڵ خۆت بهێنی با خۆی بۆم بگێڕێتەوە، بەڵام من فیرار بووم. کە مامۆستا ئیحسان چووبوو بۆ تورکیا بۆ کۆنگرەی ساڵانەی نوورسی لە ئەستەنبوڵ، لە کۆنگرەکەدا ئەو خەوەی منی گێڕابوویەوە، وتبووی برا کوردەکانمان ئاوا بە ڕۆح تێکەڵی ڕەسائیل و پەیامی نوور بوون.
دەبوو ئێمەی کورد پێش تورک و گەلانی تر خزمەت بە فکر و بۆچوون و قەڵەمی ئەو زانا کوردەمان بکردایە، بەڵام کەوتینە دوای هەموو. کورد پێویستی بە زەین و فکر و قەڵەمی نوورسیە، لە مەولانای ڕۆمی دەچێت، بەڵام بە دوو ڕوو و دارشتنی جیاواز، ڕستەکانی جۆرێک لە جادووی تێدایە، سەرنج ڕادەکێشن، پڕن لە مانا و مەغزا و فکر و زانیاریی تازە، داهێنانێکی نوێیە لە دونیای سەقافەی جیهانیدا. ئەو فکرانە دەمێکە لە ئێمە ونن، ئەگەر لە قۆناغی پێشوودا نالی و مەحوی و مەولەوی و مەولانا خالیدمان هەبووە، دوای ئەوان نوورسی هات، نوورسی لە بۆن و تام و نەکهەی ئەوانە، ئەوان بە شیعر، ئەم بە دارشتن. ئێمە ماوەیەک بوو لە تەنیایی و دووریی ژیاندا مابووینەوە، نوورسی لەو دووری و تاڵیی ژیانی کوردەوارییەوە هات و بەرەکەتی هەنگوینی فکری خۆی پێ بەخشین. نوورسی زیاتر باس لە فەلسەفە و دەرهێنانی مانا دەکات، خوێندنەوەی دونیا و عیرفان و عەقڵ و ئەخلاق و دادپەروەری دەکات. فکری ئەو شێوازێکی جیاوازترە. زۆر کەم لە کۆمەڵگەکاندا هەڵدەکەون پشتی ڕووداوەکان و دیوی ناوەوەمان بۆ بخوێننەوە، هەوڵەکانیان بۆ ئەوەیە ماندووەکان لە جەنجاڵیدا بحەوێنەوە، لە لێواری ئارامیدا بمێننەوە، بچنە دونیای شیعر و خەیاڵ، داوا دەکەن دۆستی خۆیان بن و گوێ لە خۆیان بگرن، بیرێک بۆ خۆیان بکەنەوە، سەیرێ بکەن بزانن لە کوێن، چییان بەسەر هاتووە، دەروون و لەشیان لە چڵک و چەوێڵی ژیان بشۆن، لەگەڵ مەولانا ڕامێنن، لەگەڵ شەمس شیعر بڵێن، لەگەڵ تاوەگۆزی عەشقبازی بکەن،

سەعیدی نوورسی

لەگەڵ فەرەیدون بفرن بۆ لوتکەکانی مەنتیق، بچنە نێو دونیاکەی مەحوی و بێخود و نالی و سالمەوە. نوورسی لە بۆتەی ئیسلامی کوردی و ڕیفۆرمی ئایینی دەرنەچوو، لەو بوارەدا مایەوە، تەقەی لە دەرگایەکی داخراو دا و ئاسان کردیەوە. قسەی لە فیترە و مەعریفەی دینی و ڕیفۆرم و چاکسازی کرد، ڕەخنەی بەنرخی لە پیاوانی ئایینی و بوارە پراکتیکی و دەقە دارێژراوە کۆنەکە هەیە، ڕوویەکی جیاوازتری فکری ئیسلامییە، دەیەوێ لە دەق دەرچین و تەفسیر و ڕانانێکی تر بۆ قورئان و ئیسلام و سیرە بکەین، مانای نوێیان لێ بەرهەم بهێنین، داوای ڕای جیاواز و بەهێز دەکات لەسەر ئەدەب و هونەر و مۆسیقا و گۆرانی و کولتوور و کەلەپوور و فۆلکلۆر و مێژوو، ئەو بیرتیژ و وردبین و دووربین و ئاییندەبین و جیاوازە، دەیەوێ شێوازێکی تر بێنێتە کایەوە کە لەگەڵ پوختی ئیسلام و سەردەمە نوێیەکەدا بگونجێ، دوور لەو ستایلە کۆنەی کە لەگەڵ ئەم دەمەدا نایەتەوە. ئەو بڕوای وایە کە ئیسلام بۆ هەموو سەردەمەکان گونجاوە. لە کۆندا لە چوارچێوەی چوار مەزهەبدا

خوێندنەوەیەکی پێویستی بۆ کراوە، بەڵام ئەمڕۆکە شێوازێکی تر و خوێندنەوەیەکی نوێی دەوێ، هەر لەو ڕوانگەوەیە کە ڕاکانی لە هەندێ ڕووەوە گومانی لێ دەکرێت و پێگیری لەگەڵ بۆچوونی هەندێ دەکات کە بە لایانەوە وایە ئیسلام هەر ئەوەیە کە بووە و فەقیهە کۆنەکان لێکدانەوەیان بۆ کردووە و تا سەدهەزار ساڵی تر پێویستمان بە لێکدانەوەی تر نابێت، تەنانەت سۆفی و سەلەفی جۆرێک لێی دەڕوانن، پێیان وایە بیرۆکەکانی کەسانێکی ئازاد لە فکر و ئەخلاق بەرهەم دەهێنن کە سەمع و تاعەیان نابێ و گوێ بە فیقە و شەریعەت نادەن.
نوورسی بۆ ئەم قۆناغەی ئێمە پێویستە، سەرهەڵدانی بەم زەینە کراوە ڕەخنەییە بۆ ئێمە خەڵاتە، وەک مەولانای ڕۆمییە، هەردووکیان لە دوو گۆشەنیگا و دەلاقەی جیاوازەوە خۆمان بە خۆمان نیشان دەدەنەوە. نوورسی ناگاتە وردی و قووڵیی فکر و جوانهۆنینەوەی وشە و سیحری دارشتن و پێکانی مەولانا. ئەو زەریایەی مەولانا مەلەی تیا دەکات، قووڵ و فراوان و دەوڵەمەند و ئازادترە لە دونیای نوورسی.
خۆزگە نوورسییش وەک مەولانا و مەولەوی و مەحوی لە فکردا قەڵەمێکی وەسفی دەبوو، هەمیشە ئەو زەینە خەیاڵییە شیعرییانە، ئەوانەی نائومێد و مژدەبەخشن، تێکەڵ بە وەسف و خەیاڵن و لە سێبەردا دەژین، ئەوانەی حەزیان بە دەر و خۆر نییە، تابلۆی نایابتر لە زەینی خوێنەردا جێ دەهێڵن، شەمس و عەتار و مەحوی هەر وابوون، ئەو کانیاوە تەڕ و پاراوە بەردەوامەی لە خەیاڵییەکاندا هەیە، لای واقعییەکان چنگ ناکەوێ. هەمیشە مرۆڤە خەیاڵییە بەر سێبەرەکان لە گەورەترینی داهێنانکارەکان بوون، کە ناخیان لە بوونەوەر فراوانتر و سەرچاوەی کانیاوی فکر و شیعریان بە زەریالوشەکانەوە بەندە. ئەمە لە نوورسیدا

هەست پێ ناکەم، نوورسی باسی خەیاڵ دەکات، بەڵام لە توێژاڵی نووسینەکانیدا دیارە کە هێشتا دەرگاکانی دونیای خەیاڵی نەدۆزیوەتەوە و لە لێواریدا دەژی، ئەوە یەکلابوونەوەی دەوێ، وەک شەمس و فەرەیدونی عەتار، دەبێ لە حەشامات ڕابکەیت، لە جەنجاڵیی ئەستەنبوڵدا ناکرێ. فکر بەرهەمی خەیاڵە، چەند تیایدا قووڵ ببیتەوە، ئەوەندە زیاترت دەداتێ، چەند بیدەیتێ ئەوەندە فرەتر خۆیت بۆ دەکاتەوە. ڕەنگە کێشەیەکی تری نوورسی خەتناخۆشی و شارەزانەبوون بێت لە نووسینی کوردیدا، نەیتوانیبێ ئەوەی لە ناخیدا کوڵاوە و گەییوە و مەبەستێتی، وەک خۆی دای بڕێژێتە سەر ڕووپەڕی کاغەز، ئەو وتوویەتی و خەڵک بۆی نووسیوەتەوە.

زۆرم لەسەر ژیان و فکر و بەرهەمی نوورسی خوێندووەتەوە، هەوڵ دەدەم چەند تێبینییەک لەسەر کار و فکر و هەڵوێستی ئەو مەزنە بڵێم، ئێمە گلەیی لە پێشووەکان دەکەین کە بۆچی کاریان تەنها پیاهەڵدان و وەسف و سەنا و پۆشینی کار و هەڵەی ڕابوردووەکان بووە، ڕەخنەیان بە گوناه زانیوە، هەندێ تورک گلەیی لە نوورسی دەکەن کە بۆچی ژنی نەهێناوە و سەیید نییە و کوردە، ئەو شتە لاوازانەیان بە تاوانێکی گەورە بۆ هەژمار کردووە. هەندێ تریش وەک پێغەمبەر و مەعصوم و ڕزگارکەر سەیری دەکەن، خورافیات و ئەفسانە و موعجیزات و هەقایەتی بێسەروبەر و ناواقعییان بۆ هەڵبەستووە، خەریکە لە مرۆڤ بوون دەری دەکەن، دەکرێ نوورسی وەک مرۆڤ هەندێک جار هەڵە و نەپێکان و بۆچوونی نەشاز و هەڵوێستی نەشیاوی هەبووبێت، بۆ نموونە:

١- تێکەڵییەک لە بیروڕای نوورسیدا هەیە، بە تایبەت لە نێوان هەستی نەتەوایەتی و هەستی ئیسلامیدا و بۆی یەکلا نەبووەتەوە.

٢- نوورسی دەمێک پشتی ئیتیحاد و تەرەققیی عەلمانی دەگرێت، دەمێک لە دژیان دەوەستێتەوە و حیزبیان لە بەرامبەر دروست دەکات.

٣- جارێک کوردەکان هان دەدات و بەرگری لە عوسمانییەکان دەکات و هەوڵی گێڕانەوەی خەلافەت دەدا، لە هەندێ قۆناغی تردا دژی سوڵتان و دەوڵەتی عوسمانی دەوەستایەوە.

٤- هەوڵی ڕزگارکردنی ئیمانی خستبووە پێش ڕزگارکردنی مرۆڤ، لەو ڕوانگەیەوە فکری دادەڕشت و چالاکیی دەنواند، بەڵام خەڵک ئیمانی لە مرۆڤێکی لاواز و دەستەمۆ و داگیرکراودا بۆچییە؟ قورئان و نامە ئاسمانییەکان زیاتر لە هەوڵی ڕزگارکردنی مرۆڤدا بوون، پاشان ئیمان.

٥- ئەو کە لە کوردستانەوە چوو بۆ ئەستەنبووڵ، سەرەتا وەک سەرکردەیەک دەرکەوت، لە توانایدا هەبوو زۆر شت بکات، بەڵام کە ئەستەنبووڵی بینی، خۆی نوقمی گێژاوێک کرد، هەندێ لە مەبەستەکانی لە بیرچووەوە، کەوتە نێو چاڵاوی حیزب و ڕێکخراو و گۆڤار و ڕۆژنامەکان و ون بوو، حەزی دەکرد ڕزگار ببێت، بەڵام نەیتوانی.

٦- ئەو و پیرەمێرد پێکەوە لە ئەستەنبووڵ بوونە هاوڕێ و هاوکار و لە زۆر کاردا یەک ڕایان بووە، ئەستەنبووڵ نەیتوانی پیرەمێرد لەناو ببات و مەبەستە سەرەکییەکەی لە بیر بچێتەوە، بەڵکو ڕای هێنا. ئەوەی لە ئەستەنبووڵ فێری بوو، گەڕایەوە کوردستان و بە شێوەیەکی جوانتر نیشانی گەلەکەی دایەوە، شۆڕشێکی فکریی ڕۆشنبیریی لە ناوچەی سلێمانی بەرپا کرد کە هەتا ئەمڕۆکەش ئاسەواری ماوە و جێی شانازییە، کولتوورێکی گونجانی جوانی ئیسلامی کوردانەی لە فیکر و شیعر و کارەکانیدا نیشان دا، بەڵام نوورسی نەیتوانی وەک پیرەمێرد سەرکەوتوو بێت، ئەوەی لە ئەستەنبووڵ وەری گرتووە، بیهێنێتەوە کوردستان. گەلەکەی هەر دوور لە شارستانی مانەوە، بەڵام پیرەمێرد چاپخانەی دانا و کتێب و ڕۆژنامەی پێشکەش کرد.

٧- پیرەمێرد یەک کاری ڕۆشنبیریی کوردی ئیسلامیی دەکرد، بەرنامەیەکی یەکلایەنەی هەبوو لەسەر یەک خەت و بە یەک ئاڕاستەدا دەچوو و سەرکەوتوو بوو، هیچی تری تێکەڵ نەکرد، بەڵام

سەعیدی نوورسی

نوورسی چونکە داخی زۆری بۆ کورد هەبوو، زۆر شتی تێکەڵ کرد، نەیتوانی هەموی بکات، ئاڵۆسکاو بوو و بۆی جوێ نەدەبوویەوە.

٨- نوورسی لە گەرمەی کاری ڕۆشنبیریدا لە ئەستەنبووڵەوە گەڕایەوە کوردستان و دەستەیەکی چەکدار و موجاهیدی دروست کرد بۆ بەرگری لە وان و بەدلیس دژی ڕووس و ئەرمەن، کە کاری ئەو نەبوو. شەڕی قورسیان کرد و بریندار بوو، گیرا و هەڵهات، پاشان هەزاران کوردی کۆ کردەوە و بە سەرکردایەتیی خۆی چووە شەڕی یۆنان و بەڵقان و بەریتانیا، بە زۆر پیرەمێردیشی لەگەڵ خۆی برد، ئەمە ئەوە نیشان دەدات کە نوورسی خاوەن دەروونێکی دامەزراو نەبوو، بەرزیونزمی بە کار و هەڵوێستیەوە هەیە، دەبوو لە فکرە ڕۆشنبیرییە زانستییە ئیمانییەکەی بۆ ورپاکردنەوەی کورد لای نەدایە و شتی تری تێکەڵ نەکردایە، شەڕ و جیهادی بۆ سوپا و کەسانی تر دابنایە.

٩- هەرچەند نوورسی زانستییانە بیری دەکردەوە و وەک خۆی دەڵێ، دژی ئیسرائیلیات بوو، بەڵام لە نووسینەکانیدا چیرۆکی زۆری خورافیات و خارق العادە و کەرامەت و شتی ناشەرعی و نازانستیی هێناوە، ئەو بیرۆکانە ئاسەواری خراپی لەسەر بەشێکی زۆر لە نوورییەکان هەیە، بەردەوام دەیگێڕنەوە.

١٠- نوورسی بۆ کورد چووە ئەستەنبووڵ و پرۆژەیەکی پێ بوو، بەڵام دەبینێ ئەستەنبووڵی دڵی سەڵتەنەت نەخۆشترە و پێویستی زیاتری بە چارەسەر هەیە، سەری لێ شێوا، کەوتە ناو کۆمەڵێک فکر و چەلەحانێ، خۆی و پرۆژەکەی تا ئاستێک لە بیر چوویەوە، ئەوەی بۆی چوو، نەکرا.

١١- نوورسی لە کاری ئیسلامییەوە چووە ناو کێشەی کورد، نەیتوانی وەک پیرەمێرد هەردووکیان پێکەوە گرێ بدات.

١٢- جیاوازیی زۆر دەبینم لە فکر و کاری مامۆستا نوورسی، لە نێوان فکری نەرم و هێمن و دروستی ئەو و کاری توند و تووڕە و خەڵکهاندان و کارە جیهادییەکانیدا.

١٣- جیاوازیی زۆر نابینم لە نێوان کار و هەڵوێستی سەرکردە کوردە نەتەوەیی و ئیسلامییەکاندا بە درێژایی مێژوو، هەموو تووڕە و هەڵەشە و کەمسەلیقە بوون، بابانی و ئەردەڵانی و سۆرانی و بادینی و شکاک و سانەکان و بارزانییەکان و نەهری و سەعیدی پیران و تاڵەبانی و مەلاکانی هەڵەبجە و ئەحمەدی موفتیزادە و نوورسییش هەر وابوون، هەندێ سیفەتی جوانیان هەبووە، بەڵام هەڵچوون و تووڕەیی و ئاڵۆزیی دەروونی زۆر بە کارو کردەوەیانەوە دیارە. هەر ئەوە هەموویانی لەناو بردووە و ئاسان کەوتوونەتە ناو تەڵەکان و سەری خۆیان و گەلەکەیان بە فەتەرات داوە. ئەوان نەیانتوانی نموونەیەکی جوان پێشکەش بکەن و شتێکی نوێ بۆ دوای خۆیان جێ بهێڵن، خۆیان و میللەت و سەردەمناس نەبوون و نەیاندەزانی چی دەکەن.

١٤- ئەگەر نوورسی هەر لە کوردستان بمایەتەوە، کێشەکانی جوانتر دەبینی، بیری زیاتری بۆ دەکرایەوە، چارەسەری گونجاوتری دەدۆزییەوە، شاکاری لە ڕەسائیلی نوور گەورەتر و پێشکەوتووتری بەرهەم دەهێنا.

١٥- ڕەسائیل زیاتر ڕووی سۆفیگەریی پێوە دیارە، تەنها ئاڵای ڕزگارکردنی ئیمانی هەڵگرتووە، بەڵام لە بەردەم سیاسەت و قەرەباڵغیی ئەستەنبووڵدا چۆکی دادا و داوا سەرەکییەکەی لە بیر چووەوە، سەلماندی کە بیرۆکەکانی نوور تەنها بۆ شوێنە دوورەدەستە کوردەکان شتی پێیە، لە قەرەباڵغی و جەنجاڵیی شار و شارستانیدا جگە بەخێوکردنی ئیمان شتێکی تری نییە، ڕەنگە بە هۆی پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیا و تاککەوتنی خەڵک ئایندەی ڕوونتر بێت، ئەگەر کەسی لە سونبولەکانی ئەمڕۆ بەهێزتری بۆ دروست ببێت، توانای ئەوەی هەبێ لە بنەما سەرەکییەکەی نوورسی بیترازێنێ و لەگەڵ سەردەم بیگونجێنێ.

# یەکەمینی ئەو کوردانەی ژیاننامەی «بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی»یان نووسیوە

ئەحمەد فارووق ڕەسووڵ

**١- حەمزە موکسی***

یەکەم ژیاننامەی بەدیعوززەمان لە ساڵی ١٩١٨دا لە لایەن «حەمزە موکسی»یەوە نووسراوە و وەک پاشکۆی چاپی تەفسیرەکەی بەدیعوززەمان «ئاماژەکانی ئیعجاز» کە لە لایەن خودی حەمزە موکسییەوە لە چاپ دراوە، بڵاو کراوەتەوە. حەمزە موکسی جگە لە چاپی «ئاماژەکانی ئیعجاز»، یەکەم کەسیشە کە وتەی دەیەم لە کتێبی «وتەکان»ی بە ناوی «پەیامی حەشر» لە چاپ داوە.

لە سەر بەرگی ئەم چاپەی ژیاننامەی بەدیعوززەمان نووسراوە:

«لە لایەن «حەمزە ئەفەندی»یەوە نووسراوە کە بۆ ماوەیەکی زۆر هاوڕێ و قوتابیی بەدیعوززەمان بووە. کورتەیەکە لە ژیاننامەی بەدیعوززەمان سەعیدی کوردی.

لەم ژیاننامەیەدا کە لە پێنج لاپەڕەی تورکی عوسمانی پێک هاتووە، حەمزە موکسی زۆر بە کورتی لەسەر ژیاننامەی بەدیعوززەمان دواوە، زیاتر ورد بووەتەوە لە باسکردنی ڕەگ و ڕەچەڵەکی بەدیعوززەمان،

سەرەتای خوێندنی و زیرەکیی لەرادەبەدەری لە وەرگرتنی زانستەکاندا و باس لەوە دەکات بەدیعوززەمان لە ماوەی سێ مانگدا هەموو ئەو زانستانە فێر بووە کە قوتابیی تر لە ماوەی ٢٠ ساڵ خوێندنی مەدرەسەدا بە دەستی دەهێنن.
لێرەدا گفتوگۆیەک دەهێنێت لە نێوان بەدیعوززەمان و ماموستاکەیدا، ئەم گفتوگۆ یەک دێڕییە فراوانیی بیر و توانای وەرگرتنی زانستەکان لای بەدیعوززەمان دەردەخات:
ماموستاکەی لێی دەپرسێت: «چۆن و چ زانستێکت زیاتر بە دڵ بوو؟» لە وەڵامدا بەدیعوززەمان دەڵێت: «من بۆ ئەم زانستانە بە جیا ناڕوانم. یان دەبێت هەمووی بزانم، یاخود هیچیان.»
هەروەها لە بەشێکی تری ئەم ژیاننامەیەدا، حەمزە موکسی باس لە جلوبەرگی کوردانەی بەدیعوززەمان دەکات و دەڵێت: «پەستەکی لە بەر دەکرد. هەروەها لەبەر ئەوەی لە تەمەنێکی زۆر گەنجیدا بڕوانامەی زانایی بە دەست هێنابوو، حەزی بە لەبەرکردنی جلوبەرگی زانایان نەدەکرد. چونکە لە کوردستاندا تا ئەو کاتە هیچ کەسێک لەو تەمەنەدا نەگەیشتبووە ئەو پلەوپایە زانستییە.»
هەر لەم ژیاننامەیەدا باس لە خوو و ڕەوشتی بەرزی بەدیعوززەمان دەکات و دەڵێت:
«زۆر جار زانایان بۆ تاقیکردنەوە و بەستنەوەی بەدیعوززەمان پرسیاری زۆر ئاڵۆزیان لێ دەکرد، بەڵام ئەو ئەوەندە ڕەوشتی بەرز بوو، لە حاڵەتێکدا کە لە بەرامبەردا دەیتوانی پرسیاری زۆر ئاڵۆز و بێوەڵامیان لێ بکات ، بەڵام بۆ نەشکاندنەوەی ئەوان کارێکی وای نەدەکرد.»
سەبارەت بە پەروەردەکردنی قوتابیانیشی، لەم ژیاننامەیەدا حەمزە موکسی باس لەوە دەکات کە: «هەموو خەرجی و خواردنێکی قوتابییەکانی دەگرتە ئەستۆ و تەنها و تەنها لەبەر ڕەزامەندیی خوا وانەی پێ دەوتنەوە، بەبێ وەرگرتنی هیچ بەرامبەرێک. قوتابییەکانیشی وەک کەسانی ڕاستگۆ و گیانفیدا پەروەردە دەکرد.»
نووسەر لەم ژیاننامەیەدا ئاماژە بە چەند دانراوێکی بەدیعوززەمان دەکات کە تا ئەو کاتە چاپ و بڵاو کراونەتەوە، لەوانە: «بە تورکی: موحاکەماتی بەدیعوززەمان، بە عەرەبی: ڕەچەتەی زانایان (موحاکەمات)، ڕەچەتەی عەوام (مونازەرات)، تەعلیقات، ڕوموزات، ئاماژەکانی ئیعجاز.»
لە کۆتاییشدا باسی چۆنێتیی برینداربوونی بەدیعوززەمان لە یەکەم جەنگی جیهانیدا دەکات کاتێک کە خۆی و قوتابیانی وەک خۆبەخش بەرگری لە باکوری کوردستان دەکەن لە بەرامبەر هێرشی ڕووسەکان. هەروەها باس لەوەش دەکات کە زۆر شتی زیاتری هەبووە بۆ وتن دەربارەی بەدیعوززەمان، بەڵام بۆ ئەوەی تۆمەتبار نەکرێت بە لایەنگیری و پیاهەڵدان، وا بڕیاری داوە بە شێوەیەکی زۆر بابەتییانە ئەم کورتە ژیاننامەیە بنووسێت.
حەمزە موکسی لە دوادێڕی ئەم ژیاننامەیەدا نیازی خۆی بۆ نووسینی ژیاننامەیەکی چڕتر و وردتر لەسەر بەدیعوززەمان دەردەبڕێت، بەڵام بەسەرهاتەکانی ژیانی و ئەو ئاڵوگۆڕە خێرایانەی کە لەو سەردەمەدا ڕوویان دەدا، دەرفەتی ئەوەی بۆ نەڕەخساندووە کە بتوانێت ئەو ئاواتەی بێنێتە دی.

بدیع الزمانك تاريخچهٔ حياتی

مؤلفی : عبدالرحمن

استانبول — نجم استقبال مطبعەسی
باب عالی جوارنده ابوالسعود جادەسنده نومرو ٧٥
١٣٣٥

## ٢- عەبدولڕەحمان نوورسی**

دووەم ژیاننامەی بەدیعوززەمان بە شێوەی سەربەخۆ لە لایەن عەبدوڕەحمانی برازایەوە نووسراوە و ساڵی ١٩١٩ لە چاپ دراوە بە ناونیشانی «تاریخچەی حەیاتی بەدیعوززەمان». جگە لەم چاپە سەربەخۆیە، لە ساڵی ١٩٢١یشدا وەک پاشکۆیەک هەمان ژیاننامەی هێناوە و لە کۆتایی کتێبێکی بەدیعوززەمان بە ناوی «لەمەعات»ەوە لەگەڵ زیادکردنی بەسەرهاتەکانی ژیانی بەدیعوززەمان لە ماوەی ئەندامێتی «دار الحكمة الاسلامية»دا باس کردووە و باسێکی کورتی لە دانراوەکانی بەدیعوززەمانیش کردووە لەم ماوەیەدا. ئەم چاپەی دووەمیان بە زیادەکانیەوە خۆی لە ٤٥ لاپەڕەی نووسینی عوسمانی دەدات.

وەک هەر ژیاننامەیەکی تری بەدیعوززەمان، «عەبدوڕەحمان نوورسی برازای بەدیعوززەمان»یش باسی سەرەتاکانی ژیانی بەدیعوززەمان لە کوردستان دەکات، لەدایکبوون و خوێندن و ئەو کارە دیراسییانەی ماوەی خوێندنی بەدیعوززەمان کە لە بەدیعوززەمان بینراون لە زیرەکیی و توانای فێربوونی زانستەکان لە ماوەیەکی زۆر کەمدا. زۆرێک لەم ژیاننامەیە بە شێوەیەکی زۆر ورد باس لەو مامۆستایانە و ئەو جێگەیانە دەکات کە بەدیعوززەمان هەوڵی بەدەستهێنانی زانستی لا داون. سەبارەت بە ئازایەتییەکانی بەدیعوززەمانیش لە ڕووبەڕووبوونەوەی ستەم و ناحەقیکردنی سەرۆک هۆزەکانی کوردستان، بە تایبەتی لە ناوچەی جەزیرەدا، چەند ڕووداوێک دەگوازێتەوە بۆ خوێنەر. پاشان هەر لەسەر باسی ئازایەتیی بەدیعوززەمان باس لە بەشداریکردنی بەدیعوززەمان و قوتابیانی دەکات لە بەرگرییاندا لە بەرامبەر هێرشی ڕووسەکان بۆ سەر کوردستان.

لە کۆتایی ئەم ژیاننامەیەدا بە هەمان شێوەی ژیاننامەکەی بەدیعوززەمان کە لە لایەن حەمزە موکسییەوە نووسراوە، ئاماژەیەک بە بەرهەمەکانی بەدیعوززەمان دەکات کە تا کاتی چاپکردنی ئەم ژیاننامەیە چاپ و بڵاو بوونەتەوە.

لە کۆتاییدا شیعرێکی هێناوە بە ناوی «بۆ کوردستانی خۆشەویست» کە لە نووسینی «مەحمود نەژاد سلێمانەیی»یە، کە کوڕی پیرەمێردی شاعیرە.

لە چاپەکەی ساڵی ١٩٢١یشدا پاشکۆیەکی بۆ زیاد کراوە و باس لەو ماوەی دوو ساڵ و نیوەی ژیانی بەدیعوززەمان دەکات کە لە «دار الحكمة الاسلامية»دا ئەندام بووە.

هەروەها لە کۆتایی ئەم پاشکۆیەشدا پارچەشیعرێکی لە نووسینی عەبدولمەجیدی برای مامۆستا بەدیعوززەمان هێناوە کە ستایشی دانراوەکانی بەدیعوززەمانن، بە شیعرێکی خۆیشی کۆتایی بەم ژیاننامەیە دێنێت.

**پەراوێز:**

* لە ساڵی ١٨٩٢ لە ناوچەی «موکس»ی سەر بە قەزای «وەستان»ی پارێزگای «وان» لەدایک بووە. بە ناوەکانی: حەمزە موکسی، مەلا حەمزە، حەمزە ئەفەندی، مەلا حەمزەی میکسی ناسراوە. لە سەر کێلی گۆڕەکەی بە کوردی نووسراوە: (گۆڕێ حەمزە بەگ کوڕێ حاجی بەکرێ). بنەماڵەکەی تا ئێستاش لە موکس دەژین و لە بنەماڵە چالاک و بێبەشەکانی ناوچەکەن. لە موکس لە مەدرەسەی میر حەسەن وەلی و لە وان لە مەدرەسەی خورخوڕ و لە ئەستەنبووڵیش لە بەشی زمان و ئەدەبیاتی فارسیی زانکۆی ئەستەنبووڵ و مەدرەسەی وتاربێژان خوێندوویەتی. ماوەیەک لە ئەستەنبوول مامۆستا بووە. ساڵی ١٩٢٧ ماوەیەک لەسەر چالاکییەکانی بەند کراوە. دواتر ڕۆیشتووە بۆ شاری حەسەکەی خۆرئاوای کوردستان و لەوێ لە ڕێکەوتی ١٩٥٨/٤/٥ کۆچی دوایی کردووە. یەکێک لە خزمەتە گرنگەکانی چاپکردنی «مەم و زینی خانی» بووە لە شاری حەڵەب.

سەعیدی نووریسی

** ناوی «عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدوڵڵا»یە و برازای مامۆستا نوورسییە. لە ساڵی ١٩٠٣ز لە گوندی «نوورس» لە دایک بووە. ساڵی ١٩٢٨ لە گوندی «زولفەزل»ی نزیکی ئەنقەرە کۆچی دوایی کردووە، خوا لێی خۆش بێت.